# خودپەسەندی

فاتیح مەلا رەسول شارستێنی

چاپی یەکەم

٢٠١٤ ز - ١٤٣٥ ک

## کورتەیەک

سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگار، ئەو خوایەی کە هەرچی هەمانە هەمووی لە فەزڵ و ڕەحمەت و بەخششی خۆیەتی.

دروودو سەلامی خوا لەسەر پێغەمبەری پێشەوامان موحەمەد (ﷺ) کە سوپاسگوزارترین بەندەی خوا بوو، وە خۆپەرستانی وەکو ئەبو جەهلەکانی زەمانی لە شانۆی ژیان لابردن، ڕەزاو ڕەحمەتی خوا لە هاوەڵانی پایەبەرزو شوێنکەوتووان و هەموو ئیمانداران بە گشتی.

خوێنەری سەنگین: ئەوەی کە ژیانی مرۆڤایەتی لە ژیانەوە کردووە بە ژان کەسانی خۆپەرستن، جا لە بواری سیاسی و حوکمڕانیدا بێت، یان ئابووری و فەرهەنگ و ڕۆشنبیریدا بێت، کەسانی خۆپەرستە بوونەتە خۆرکەی ژیان، کە سەرەنجامیان بەدبەختی خۆیان و بەدبەختکردنی کۆمەڵگای دەوروبەریانە، لەم ڕووانگەیەوە ئەم کورتە باسە دەخەینە بەر دیدەو دەستی بەڕێزتانەوەو ئێوەش دۆعای خێرمان بۆ بکەن.

فاتح شارستێنی

# بەشی یەکەم

الحَمْدُ لِلهِ رَبِّ العالَمين والصَّلاة والسَّلام عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدْ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعين.

ئیمانـداران: مرۆڤ بە فیتـرەت کەسێکی کۆمەڵایەتیەو ناتوانێ بە تەنیا بژی. جا مرۆڤ کە لەناو کۆمەڵدا ژیا، ئەوا یا کەسێکی گونجاوەو گوێ بۆ خەڵکی دەگرێ و خەڵکی گوێی بۆ دەگرن، پرس و ڕاوێژ دەکاو پرس و ڕاوێژی پێ دەکرێ (المؤمـنُ إلـف مألُوفٌ)، ئیماندار تێکەڵ بە خەڵکی دەبێ و ئەگەر قسەیەك، کردارێك، ڕەفتارێکی بەرامبەر کراو لەگەڵ ئارەزوی ئـەودا نەگونجا، ئەوا تـوڕە نابێ و ئارام دەگرێ و تەنها خۆی بەڕاست نازانێ. پێغەمەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (المُؤْمِنُ الَّذِي يُخَالِـطُ النَّـاسَ وَيَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ خَيْرٌ مِنْ الَّـذِي لَا يُخَالِطُ النَّاسَ وَلَا يَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ) أَخرَجَهُ ابنُ مَاجَهْ بِإِسْنَادِ حَسَنٍ.

ئـەو ئیماندارەی کەوا تێکەڵی خەڵکی دەبێ و ئارام دەگرێ لەسەر ئەو ئازارو ناڕەحەتیانەی کە لەئەنجامی ئەو تێکەڵاویەدا

توشـــی دەبێ، چاکترە لەو کەسەی، لەو ئیماندارەی کە تێکەڵی خەڵکی نابێ و ئارام ناگرێ لەسەر ئازارەکانیان.

بەڵام ئەگەر کەســێك خۆی پێ ڕاســت بوو، وە چاوی تەنها خــۆی دەبینی، وە گاڵتــەی بە عەقڵی خەڵکــی دەهات، تەنها بەرژەوەندی خۆی دەویست و دونیای لە چاوی بەرژەوەندیەکانی خۆیــەوە دەبینــی، دونیــا هەمــووی کاول ببوایــە تەنها ئەو مەصڵەحەتی بڕۆیشتایە بەلایەوە گرنگ نەبوو، هیچ کات گوێ ی بــە بەرژەوەندی خەڵکی نەدەدا. ئــەوە لە زمانی عەرەبیدا پێی دەڵێن کەســێکی ئەنانی یە کــە (ئەنانی) لە (أنا، أنا) من، مــن وەرگیــراوە. ئەوەندەی بیــر لە خۆی دەکاتــەوە، بیر لە کەســی تر ناکاتەوە. بە زمانی شیرینی خۆمان پێ ی دەوترێ - خۆپەرست-.

جا قورئانی پیرۆز باســی ســێ وشــەی نابەجێ دەکات، کە لە ســێ کەســی جیاوازەوە دەرچووە. ئەوانیش وشەی (أنا) کە ئیبلیس ووتــی: ﴿أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ﴾ من لەو چاکترم ـ لە ئادەم ـ بۆ؟! بەهۆی ئەصڵ و فەصڵمەوە، من لە ئاگرم، ئەو لە قوڕە. سەیرکەن، (أنا)، من، من..

ئــەم (أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ)ی ئیبلیس هەتــا قیامەت بەردەوامە، وەکو مەدرەســەیەك وایە، ســەدان و هــەزاران خوێنــدکاری هەیە

لەبەرگی جیاوازدا، لە زەمان و زەمینی جیاوازدا، هی وا هەیە شانازی بە زانست و شەهادەکەیەوە دەکات، هەمیشە دەڵی: من وام و من وام، وەکو ئەوەی کەس هیچ نەزانێ. حساب بۆ کەس ناکات.

هی وا هەیە شانازی بە بە نەسەب و بنەماڵەکەیەوە دەکات دەڵێ: (من لە فلان بنەماڵەم). مەبەستی ئەوەیە چۆن هاوشانی فلان کەسم کە لە فلان بنەماڵەی ترە. تەنانەت ئەم نەخۆشی یە پیسە جاری وا هەیە لە ناو خەڵکانی زۆر ئیماندارو ئەهلی مزگەوتیشدا زیندوو دەبێتەوە. بەڵام بە نوری ئیمانە کە یەکسەر بەرچاوی ڕون دەبێتەوەو هەست بە کەموکوڕی خۆی دەکات و پەشیمان دەبێتەوە. هەروەکو صەحابی پایە بەرز (ئەبو زەڕی غیفاری) لە کاتی دەمەبۆڵەو قسە تێك گیراندا بە بیلالی حەبەشی ووت: کوڕی دایك ڕەش!! بەڵام هەر زوو پەشیمان بۆوەو داوای لە بیلال کرد بەو قاچە ڕەشانەی پێ بخاتە سەر سەر دەموچاوە سپیەکەی ئەم! بەڵام بیلال گەردنی ئازاد کرد.

یاخود ئەم ئەنانیەتە بە هۆی پلەو پایەو دەسەلات و دەست ڕۆیشتوییەوە توشی مرۆڤ دەبێت. کاتێ مرۆڤ حەرەس و حیمایە لە پشتی خۆیەوە دەبینێ، پلەو پۆستی خۆی لە

حکومەت و ســـوڵتەدا دەبینێ. ئەمجا خۆی لە ئاستی کەسێکی بێ دەســـەڵاتی، بێ خزم و کەســـەوە دەبینـــێ، وا ئەزانێ ئەم هاوشانی ئەو نی یە و ئەو هاولاتییەی پێ کەمە، بێ دەسەڵاتە، مافـــی ئەوەی نی یە لەگەڵ ئەودا بە ڕێـــگادا بڕوات، یان بەو ڕێگایانەدا تێپەڕێت کە ئەو خاوەن پایەی پێدا دەڕوات.

یان لە فەرمانگەو دائیرەدا نابێ ئەم وەکو ئەو سەرە بگرێ، چونکە دەڵێ: (أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ).

هەروەکو لە مێژوی ئیســـلامیدا بۆمـــان دەگێڕدرێتەوە کە لە (میصر) لـــە زەمانی خیلافەتی حەزرەتـــی عومەری کوڕی خەتابدا، فەرماندەی بەناوبانگی ئیسلام (عەمری کوڕی عاص) کە والی میصر بوو، لەکاتی پێشبڕکێ ی ساڵانەی ئەسپ سواریدا کـــە وەکو پاڵەوانێتی وەرزشـــی ئەنجـــام دەدرا. کوڕی عەمری کوڕی عاص لەکاتی پێشبڕکێ دا، پێش هەموانی دایەوە، تەنها یەك کەسی لە هاوشانی خۆیەوە بینی کە ئەسپەکەی تاودابوو، دەیویست یەکەمی پێشبڕکێ ی ئەسپ سواری بەدەست بهێنێ.. کوڕی عەمر کە ســـەیری خۆی کرد، ئەم کوڕی والی میصرەو باوکـــی بەناوبانگترین فەرماندەی ســـەربازیەو خاوەن نفوزو دەســـەڵاتە، ئەو کەسەش کە دەیەوێ پێشبڕکێکەی لێ بباتەوە، کەســـێکی قیبتی، مەسیحی  میصرەو بێ پشتیوان و بێ کەس

و کارەو هاولاتیەکی وەرزشـــکاری ســـادەیە. بۆیە یەکســـەر لە دڵی خۆیدا ئەنانیەتی جولاو، وشـــە ناشایستەکەی ئیبلیس لە ناخیدا جـــولا (أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ). بەلام ئەم بە جۆرێکی تر تەعبیرو گوزارشـــتی لەم بۆچونـــەی داو، لەگەڵ لێدانـــی قەمچیەك لە پشتی بۆ ئەوەی هێزی لێ ببڕێ و دوای بخاو خۆی یەکەمیەکە بەدەســـت بێنێ. پێشـــی ووت: ئەم قەمچیە بگرەو بشزانە کێ لێت دەدات. بمناســـە (أنا ابن الأکرمین). من کوڕی چاکترین و بەڕێزترینم!!. تەماشاکەن (أنا) چۆن مرۆڤ بە هەڵەدا دەبات.

بـــەلام کاتـــێ ئـــەم گەنجە بـــێ کەســـە، مەزلومە شـــکوای مەزلۆمییەتـــی خۆی بردە لای خەلیفەی مســـوڵمانان ئیمامی عومەر، لە ئەفریقاوە ڕۆیشـــت بۆ ئاســـیا، لـــە میصرەوە چوو بۆ مەدینە، بۆ لای کاربەدەســـتی دادپـــەروەر. ئیمامی عومەر هـــەرزوو بڕیـــاری دادپەروەرانـــەی خـــۆی دا. ئـــەم (أنا) یەی هەڵوەشـــاندەوەو بڕیاری دا کە ئەو قیبتیە، مەزلومە، ســـتەم لێکـــراوە، تۆڵـــە لە کوڕەکـــەی عەمری کوڕی عـــاص بکاتەوەو قەمچیەکـــە لە پشـــتی بداتەوە و تەنانەت فەرموشـــی: ئەگەر حەز دەکەیت قەمچیەکیش لە پشـــتە سەری سەرە ڕوتاوەکەی عەمری باوکیشـــی بدە، چونکە کە سەیری پلەو پایەی باوکی کردووە ئاوا ئەنانیەت و خۆپەرستی گرتویەتی.

دوای ئەوەی تۆڵە وەرگیرایەوە. ئیمامی عومەر ئەم ڕستە جوانەی فەرموو، کە هەر دەبێ قسەی عومەری دادپەروەر بێ کە فەرمووی: (متى استعبدتم الناسَ وقد وَلدتهم أمهاتُهم أحراراً) ئەرێ تا کەی خەڵکی دەکەن بە کۆیلە، لە کاتێکا بە ئازادی لە دایك بوون؟!.

ئەمڕۆش دەبینین چۆن کوڕی بەرپرسانی حیزبی وحکومی بــە ئوتۆمبێلە ئاخــر مۆدێلەکانیان. کە بە پــارەو قوتی ئەو میللەتە کڕیویانەو دزیویانە، پۆز بەسەر خەڵکی پاکو هاوڵاتی ســادەی دڵ پاکی ئەم کوردســتانەدا لێ دەدەن و دەڵێن (أنا ابن الأكرمــين)، بــەڵام بەداخەوە عەدلی عومەری نی یە پشــتیان نەرم بکات ئەو (أنا) یەیان لە بیر بباتەوە.

کەواتە: هۆکاری یەکەم بۆ ئەوەی مرۆڤ توشی ئەنانیەت و خۆپەرســتی ببێ، بریتی یە لە (أنا، أنا) من، من. من هاوشانی خەڵکی نیم.

ووشەی دووەم: (لی) کە فیرعەون وتی: ﴿ أَلَيْسَ لِي مُلْكُ مِصْرَ وَهَٰذِهِ الْأَنْهَارُ تَجْرِي مِن تَحْتِيٓ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴾ الزخرف: ٥١.

واتــە: فیرعەون جاڕیدا بەناو قــەوم و گەلەکەیداو ووتی: ئــەی قەوم و گەلم، من پاشــای میصــرم و فەرمانڕەوای ئەم وڵاتەم، ئەو ڕووبارانەش بەبەر کۆشــکەکانمدا دەڕوات. ئایا ئەم دەسەڵاتەی من نابینن؟!.

هەروەها فیرعەون بۆ خۆپەرستیەکەی (أنا) شی بەکاردەهێنا.

بە دەســەڵاتەکەی بوغرا ببوو. کاتێ کە تەماشای موسای پاکو خاوەن دەست ســپی دەکرد، بە هاوشانی خۆی نەدەزانی و بە چاوی ســوك سەیری دەکرد. فیرعەون بە قەومەکەی دەگوت:

﴿ أَمْ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى هُوَ مَهِينٌ وَلَا يَكَادُ يُبِينُ ﴾ الزخرف: ٥٢.

واتــە: ئایا نابینن من چاکترم لەو کەســەی ناوبانگی نی یەو کەسایەتیەکی لاوازو نەناسراوەو زمان پاراو نی یەو لەوانە نی یە بتوانێت چاك خەڵکی تێبگەیەنێت.

هەروەها فیرعەون ئەوەندە خۆپەرست بوو کە بە قەومەکەی دەگــوت: ﴿ مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴾ غافر: ٢٩.

واتە: من تەنها هەر ئەو ڕاو بۆچونە بەچاك دەزانم و لام پەسەندە کە پێم ڕاگەیاندن. من تەنها ڕێبازی چاك و دروستم نیشانداون!!

هەروەها فیرعەون بە پەڕلەمانە کارتۆنیەکەی و دەربارەکانی دەگــوت: ﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِى ﴾ القصص: ٣٨.

واتە فیرعەون سەرکەشانە ووتی: ئەی خەڵکینە من کەسی تر شك نابەم کە شایستە بێت بەوەی خواتان بێت. جگە لە خۆم!..

بەڵێ ئەمــەش کە فیرعەون ووتی. بوو بە مەدرەســەیەك کــە هەرچی دیکتاتۆری ســەر زەوی یە هەمان شــت دووبارە دەکەنەوە (قســە هەر قســەی منە، ڕێی و بۆچونی پەســەند ئەوەیە من پەسەندی بکەم، ئەوە چاکە من پێم چاکە).

بەداخــەوە خەڵکیش یان لە ترســان یان بۆ ماســتاوچێتی چەپڵــەی بۆ لێــدەدەن و دەڵێن: (إذا قال صــدام قال العراق). واتە: عەقڵی ئەو هەموو ملێون خەڵکەی ئەم وولاتە بە قەدەر عەقڵی ئەو ســەرۆکە کار نــاکات!!! یەعنی عەقڵی ئەو هەموو میللەتە بەو هەموو خەڵکە زاناو پرۆفیسۆرو دکتۆراو یاساناس و پیتۆڵ و حەکیمەوە یەکسانە بە سفر!!

ئەی خۆ بینیمان دیکتاتۆرەکەی میصر ـ حوسنی ناموبارەك ـ کە سەرەتای خۆ پیشاندان و ناڕەزایی خەڵکی وولاتی میصر کە دەیان ساڵ بوو سەرکوت کرابوو، دەستی پێکرد، هاتە سەر شاشەوە دەیگوت: خۆ من حەزناکەم لەسەر دەسەڵات بمێنمەوە، بەڵام هەرچەندە ســەردێنم و سەر دەبەم و بیردەکەمەوە. تا کەســێك کە شــایانی ئەوە بێ لە جێگای من بــێ، تەنها هەر (خۆمم) !!! بەڵام چارەنوســی ئەم خۆپەســندە، ئەم ئەنانییە، کە فیرعەون سەر قافڵەیەتی و هەزاران دیکتاتۆر هاوڕێبازانی چییە؟!.

ئەوە چارەنوسیانە کە ڕۆژێ بەرامبەر حەق و ڕاستی وەکو میزڵدانێ کە فوی تێکرابێ و بڕوا بە ڕوی ئاسمان. بەڵام هەرکە دڕکێکی پێداچوو، شتێکی بەرکەوت، فش دەبێتەوەو دەکەوێتە سەر زەوی و حەجم و قەبارەی ڕاستەقینەی دەردەکەوێ. ئەم خۆپەســـندانەش کاتێ زانیان گڕۆڵەیان کەوتۆتە لێژی ئەمجا دەگەڕێنەوە بۆ ڕەئی میللەت!، هەروەکو فیرعەون کە تینی بۆ هات بەرامبەر موســـای ڕزگارکاری چەوســـاوان و پشت شکێنی زاڵمان، ووتاری بۆ جەماوەر دەداو دەیکوت: ﴿قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُۥٓ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِۦ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ﴾ الشعراء: ٣٤ — ٣٥.

واتە: فیرعەون هیچی بۆ نەمایەوە، بەدانیشتوانی دەوروبەری خۆی ووت: ئەم موسایە جادوگەرێکی زاناو شارەزایە. دەیەوێت لەســـەر زەوی خۆتـــان دەرتان بـــکات بەهـــۆی جادوەکەیەوە، فەرمانتـــان بە چـــی یە؟ چی بکەین باشـــە تا ســـنورێکی بۆ دابنێین؟!

هـــەزار ڕەحمەت لە وتاربێژی حەق بێژ، شـــێخ عبدالحمید کشـــك، کە لە ووتارێکیدا لە خطب الشیخ عبدالحمید کشك ج ٨ ص٢٧ دا نوســـراوەتەوە. لەسەر شـــیکردنەوەی ئەم ئایەتانە دەفەرموێ: (مَتَى كانَ فرعون يَأْخُذُ رَأيَ غَيرِهِ؟! هكذا الدِكتاتوريَة

إذا شَعَرَتْ بالفَشَلِ تَرجِعُ إلى الشَعب، وبَعدَ ما يَصفُو لها الجَوُّ، تَفتَحُ السُجونَ للشعوب).

بەڕاستی جێ ی سەرسوڕمانە. ئەوە کەی فیرعەون وای لێهاتوە دەگەڕێتەوە بۆ ڕای خەڵکی؟! بەڕاستی دیکتاتۆریەت ئاوایە. هەرکات هەستی بە فەشەل و هەڵوەشان و ڕۆژی ڕەشی خۆی کرد، دەگەڕێتەوە بۆ ڕای خەڵکی و بۆچونیان وەردەگرێ و ڕاپرسی دەکات! بەلاَم هەرکات مەترسی لەسەر نەبوو. جەوەکەی بە دڵ بوو. ئەوە دەرگای زیندانەکان بەسەر گەلدا دەکاتەوە!.

بەلاَم سەرەنجامی فیرعەونیش هەر تیاچون بوو. هەر بەو نیلەی شانازی پێوەدەکرد تیاچوو!..هەروەکو ئیبلیس بەهۆی ئەو ئەنانیەت و خۆپەرستیەوە بە لەعنەت کرا..

سێیەم: ووشەی سێ یەم کە خۆپەرستان بەکاری دەهێنن (عندی). کە قارون ووتی: ﴿ قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓۚ ﴾ القصص: ٧٨.

ئەمەش کە قارون ووتی و بەردی بناغەی دانا، بوو بە بناغەی مەدرەسەی فیکری سەرمایەداری.. ئەمڕۆ جیهانی سەرمایەداری دەڵێ: گرنگ ئەوەیە پارەت دەست بکەوێ. ئیتر شتێك نی یە بەناوی حەرام. وە شتێك نی یە ناوی قەرزی بێ سوو ـ ڕیبا ـ بێ.

بـــەڵام ســـەرەنجامی قارونی خۆپەرســـتیش هەر بە هیلاك چوون بوو. ﴿ فَخَسَفۡنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلۡأَرۡضَ ﴾ القصص: ٨١.

ئەمرۆش لە سەدەی بیست و یەکدا، وا جیهانی سەرمایەداری بەهۆی ڕیبا خۆریەوە، بە دەیان بانکی گەورە ئیفلاســی خۆی ڕاگەیاند، وەکو قارون و سامانەکەی بەناخی زەوی لەناوچوندا ڕۆچوو.

بەڵــێ لەبواری تاکەکەسیشــدا دەیان کــەس هەن کە خوای گەورە ماڵ و ســامانی زۆری خستونەتە بەردەست، بەڵام وەکو قارون خۆپەرستن.

ســەرنجی ئەم ڕوداوە ڕاســتەقینە بدەن، کــە دکتۆر محمد راتب النابلســی، لە کتێبە بەنرخەکەیدا (موســوعة أسماء الله الحســنی ج١ ص١٥٢) دا دەفەرمــوێ: کوڕێکی گەنجی زۆر ڕێك و پێکی بەدین و خواناس، ڕەوشــت بەرز، ســیما پاك و جوان، چــووە خوازبێنی کچی کابرایەکی دەوڵەمەند، کە کچەکە زۆر دینــدارو ڕەوشــت بەرز بوو. بەڵام باوکی چــاوی تەنها پارەی دەبینــی. بۆیــە کاتێ ئەم کــوڕە چووە خوازبێنــی ئەم کچە، باوکی کچەکە تەنها یەك پرســیاری لە بنەماڵەی کوڕەکە کرد. ئەویش ئەوە بوو: ئەم کوڕە کە دەیەوێ ببێتە هاوسەری کچی من، مانگی چەندی دەســت دەکەوێ؟! ووتیان: ئەوەندە. باوکی

کچەکــە بە لوت بــەرزی و تەکەبورێکەوە ووتی: جا خۆ ئەوە پارەی سەعاتێکە کە من پەیدای دەکەم، یانی ئەو یەك مانگی تەواو پارەی یەك ســەعاتی من پەیــدا دەکات؟! من چۆن کچ دەدەم بە هەژاری ئاوا. کچی من بەو بەخێو ناکرێ!!

بەم شــێوەیە ئەم خۆ پەســەندە ئەم بنەماڵە بەڕێزەی لە ماڵەکەی کردە دەرەوە. بەڵام نە ئەم کوڕە ژنی هێنا، نە ئەم کچە شوی کرد. ساڵ هاتن و ڕۆیشتن ﴿وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ﴾ آل عمران: ١٤٠.

ئــەم پیاوە بازرگانە، بازرگانـــی و معامەلەکەی ڕۆژ بە ڕۆژ ڕوو لە شکســـت بوو، هەرچەند دەیویســـت هەستێتەوە زیاتر تێدەشکا، تا هیچی نەما، ئیفلاسی کرد، خواخوای بوو کارێکی باشی لای یەکێ دەست کەوێ، ئەم کوڕە گەنجەش خوای گەورە دەرگای ڕزق و ڕۆزی فراوانی لێکردەوەو بوو بە سەرپەرشتیاری پرۆژەیەکــی گــەورەو لەبــەر دەســـت پاکــی و ئەمینی وەکو خــاوەن کۆمپانیا وا بوو، باوکــی کچە دەوڵەمەندەکەی جاران، زۆر بەمەمنونـــی یـــەوە چووە لای و داوای لێکرد لەســـەر کار دایبمەزرێنێ {جا خەڵکی خۆپەرست هیچی پێ عەیب نی یە، ئەگەر هەی بوو وەکو کەر دەزەڕێ، ئەگەر نەیبوو وەك ســـەگ دەوەڕێ}. لەبیر خــۆی دەبردەوە کە ئەمە هەر ئەو گەنجەیە

کە ئەم وایئەزانی کچەکەی ئەمی پێ بەخێو ناکرێت، بەڵام ئەم کورە مســوڵمانە دڵفراوانە، باســی ڕابردووی نەکردوو هەر لە ڕوشی نەدایەوە، بەگەرمی پێشوازی لێکردوو کارێکی شایستەی پێســپاردو سەرەنجام ئەم پیاوە خۆی ملی ئەم گەنجە صاڵحە، خواناسە، بەڕێزەی گرت و داوای لێکرد کە کچەکەی پێشکەش بکات! کوڕەکەش بە سوپاسەوە دەستی ماچ کردو بە کچە پاکە خواناسەکە شاد بوو.

کەواتە هەرگیز بەهۆی دەوڵەمەندیەوە مەبە بە کەســێکی خۆپەسەند، چونکە سەرەنجامی خراپە.

ئەمڕۆ بەداخەوە خۆپەرســتی و ئەنانیەت بە چەند شێواز دەبینــرێ. بەڵام هەموی پەشــیمانی لەدوایــە. ئەمەش چەند نمونەیەك لە خۆپەرستی:

خۆپەرستی لە ژیانی خێزانیدا: پیاوی وا هەیە خۆپەسەندو ئەنانــی یەو لەناو خێزاندا تەنها بــڕوای بەڕاوبۆچونی خۆی هەیە، پرس و ڕاوێژ بە خێزان و مناڵەکانی ناکات، مناڵەکانی ماچ ناکات، لەگەڵیان دانانیشێ، نانیان لەگەڵ ناخوات..

هەروەهــا ژنــی وا هەیە ئەوەنــدە خۆپەســەندە هەرچی حیســاب بێ بۆ میردەکەی ناکات. کاتێ کەســانێك دەچنە لای هاوســەرەکەی بۆ ئەوەی باسی شــتێکی لەگەڵ بکەن ئەم ژنە

یەکسـەر دێتـە وەڵام و بڕیـار دەردەکات و هیچ حسـاب بۆ هاوسەری، هاوژینی ژیانی ناکات..

جاری واش هەیە کوڕێك لەماڵدا. یان کچێك لە ماڵی باوکیدا. ئەوەندە خۆپەرستە، خۆی کردووە بە دەمڕاستی ماڵ و ژیانی ئەم خێزانەی ناخۆش کردوەو حساب بۆ دایك و باوك و خوشك و براکانی ناکات.. جا بەڕاسـتی هەر خێزانێك خۆپەرسـتی و ئەنانیەتی تێدا بێ خۆشـبەختی لێ باردەکات و بارگەو بنەی دەپێچێتەوەو نائارامی زاڵ دەبێ بەسەر ژیانیاندا.

هەرکەسـێ تەنها خۆی ببینێ و وا بزانێ ئەوەی هەیەتی. لە نان و لە ئاوو لە مەکانەت و پلەو پایەو منداڵ و ماڵ. هی ئازایەتی و جوامێری خۆیەتی، ئەوە بەڕاستی بە هەڵە چووە. ئەوە خوای گەورە پەندو وانەیەکی وای دادەدا کە دەیکات بە پەند..

بانگخـوازی نـاوداری سـوری (د. محمـد راتب النابلسـی) دەفەرموێ: ژنێك کە شوی بە پیاوێك کردبوو، کە چەند ساڵ بوو ژیانی هاوسەری پێکەوە نابوو، بەڵام منداڵی نەبو بوو. ئەم ژنەی کە زانی بە پشکنینی پزیشکی هۆکاری منداڵ نەبونەکەی لەمەوەیە، داوای لە مێردەکەی کرد کە بچێ ژنی دووەم بێنێ و با لەخۆشی منداڵ مەحروم و بێ بەش نەبێت. ئەوەبوو کابرا ژنـی دووەمی خواسـت و ئەم ژنەیان هـەر زوو کەوتە بواری

حامیله بوون و منالّ بوونەوە. دوای چەند ساڵێك كە ئەم ژنە تازە دوو منالّی هەبوو، وە حامیله بوو بە منالّی سێ یەمی. بە هەویەكەی ووت: قســە لە قسەمدا نەكەی هەی وەجاخ كوێر. ئەگــەر هیچ بویتایە منالّێكت دەبوو!! تۆ تەنها خزمەتكارێكی لەم مالّەداو هیچی تر. ئەوەتا من مندالّێك لە سكمایە، منالّێكم بەبەر مەمكەوەیە، منالّێكم لەتەنیشــتەوە دانیشتووە.. لەبەر ئەوە (من) هاوشانی تۆنیم!!

بەلاّم كێ باوەڕدەكات كە لەماوەیەكی كەمدا منالّەكەی سكی لەبارچوو. دوو منالّەكەی تریشــی یــەك بەدوای یەكدا مردن! وەهیچ منالّی تریشی نەبوو دوای ئەوە. بەلاّم پاكی و بێگەردی و دەســەلاّت هەر بۆ خوای پەروەردگارە كە ئەو ئافرەتەی كە چەندین ســالّ بوو منالّی نەبو بوو. خوای گەورە لەسەر یەك پێنج منالّی كوڕی پێ بەخشــی!! وە ئەو ژنە تازەیە بووە بێ منالّ و لەلای ئەمان بەخێو كرا!!!

مامۆســتا ملا ئەحمــەدی ســیوەیلی لە شــیعرێكدا لەژێر ناونیشانی (بەشی خودا) دەفەرموێ:

شانازی مەكە بەسەر خەڵك و خاك
تۆش وێنەی ئەوان ئەبیتەوە خاك
لەم ژیانە كەمەی دونیای بێ بەقا

بەرامبەر بە خوا با بتبێ وەفا
هەموو ساتێکی ژیانت هۆشیاربە
بەدەست خۆت نیە جوان ئاگاداربە
هێنەرو بەخشەر بۆ لاشەو گیانت
هەر خوایە چاکەی ئەوێ، نە زیانت
هەست و زانین و بینین و بیستن
جوانی و دەسەلات، بێداری و خەوتن
ئەولادو ماڵ و خزم و دۆست و کەس
توانای خۆت نی یە، عەگای خوایەو بەس..

ئیمانداری بەڕێز، مرۆڤی وشیار: ئاگاداربە زۆر خۆپارێزبە لــە خۆ پەســـەندی، بە تایبەت ئەو کاتانەی کە ئیشــێك هەر بەتۆ دەکــرا، خەڵکی دەهاتنە بەر دەرگات. جا کاربەدەســـتی، مامۆســـتای، خاوەن پیشـــەیەکی، پیاو ماقوڵێکی، دوکتۆرێکی، دەوڵەمەندێکی. نەچی بەفرســـەتی بزانی بڵــێ ی تەنها (من) هــەم ئیتر چۆنم بوێ ئــاوا ڕەفتار دەکەم، چونکە عاقیبەت و سەرەنجامی نەدامەتیە.

هــەر د. محمد راتب النابلســی دەفەرموێ: حەفتا هەشـــتا ســـاڵێك لەمەوبەر لە دیمەشقی سوریا. دکتۆرێکی پیاو هەبوو، ئەم پزیشکە هەرچەند پیاو بوو. بەڵام پسپۆڕیەکەی لە بواری

ژنـــان و منـــاڵ بوونـــدا بوو. جگە لەو لە شـــاری دیمەشـــق و دەوروبەریدا هیچ دوکتۆرێکی بواری ژنان نەبوو، جا ئەم پزیشکە ئەمەی بەهەل دەزانی و هەرکاتێ ئافرەتێك پێویستی پزیشکی هەبوایەو نەیتوانیایە بە پێی خۆی بێت بۆ عەیادەکەی و ئەم بچوایە بۆ ماڵیان، دەبوایە هاوسەری ژنەکە، عەرەبانەیەکی بۆ بەکرێ بگرتایە - کە وەکو تەکســـی ئێستا وابوو - وە هەروەها لیرەیەکیشـــی بدایە حەقی ئەوەی کە عەیادەکەی جێهێشتووە. بێجگە لە پارەی دەرمان وحەق دەستی تایبەتی خۆشی!! ئەمجا هەرچەند ماڵی نەخۆشـــەکە بپاڕانایەوە کە هەژارن و پارەیان نی یە. دەیگوت: ئەوە موشـــکیلەی خۆتانەو من حەقم بەسەر ئەوەوە نی یە هەتانە یان نا!!.. دکتۆر محمد راتب نابلسی کە ئـــەم بەســـەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە دەفەرمـــوێ: بۆیان باس کـــردوم کە: ئافرەتی نەخۆشـــی وا هەبووە کـــە ڕاخەری ژێر نەخۆشەکەیان فرۆشتوەو نەخۆشەکەیان لەسەر زەوی ڕاکێشاوە، تەنهـــا بۆ ئەوەی لیرەکەی بـــۆ پەیدا بکەن و دکتۆرەکە بێننە سەری و ئەم ژنە داماوە لەو ئازارە ڕزگاری ببێ!!

بەڵێ دوای چەندین ســـاڵ لە کاری پزیشکی و کۆکردنەوەی پارەیەکی زۆر، لە خۆشـترین جێگای شاری دیمەشق، جوانـترین و سەرنج ڕاکێش ترین خانوی کرد، ئەم کۆشکە هەتا ئێستاش

لە دیمەشــقی ســوریا ماوە. بەڵێ کاتێ کە چووە ناو خانووە بێ وێنەکەیەوە. ســبحان الله، هەر ئەو شەوەی کە چووە ناوی جەڵدەی دەماغ لێی داو توشــی شــەلەل بووا! ماوەیەکی کەم ژنەکــەی خزمەتی کردو بەدەوریەوە بوو. بەڵام کە زانی تازە ئومێدی چاك بونەوەی لێ ناکرێ، داوای لە مناڵەکانی کرد کە بیبەنە هەورەبانــی خانوەکەیانەوەو خزمەتکارێکی بۆ بگرن، کە خواردنی بداتێ و پاکی بکاتەوە!!

بەڵێ ئەم پزیشــکە کە بەو بێ ویژدانیــە تەواوی تەمەنی پارەی بۆ ژن و منالەکەی کۆکردبۆوە. لە پێناوی ئەوەی زیاتر دەوڵەمەند بێ و کۆشــك و تەلاری جوانترو خواردنی خۆشتر بۆ ژن و منالەکەی ئامادە بکات، بەو هەموو زانســتەی کە لە بــواری پزیشــکی ئافرەتاندا هەیبوو، تەنها یەك خزمەتیشــی لەبــەر خاتری خوا بە نەخۆشــێکی هەژار نەکــرد، بۆیە وای دەزانــی کە ژن و منالەکانی لەم نەخۆشــیەدا لەســەر چاوی دەگرن. بەڵام کە ســەیری کــرد وا خزمەتکاریان بۆ گرتووەو ژنەکەی دیار نی یە، داوای خێزانی کرد. خزمەتکارەکە هەموو جــارێ لە هەورەبانەکەوە دەهاتە خوارەوەو دەڕۆیشــتەوە بۆ سەرەوە بۆ لای و ڕوی نەدەهات بلێ: ژنەکەت دەڵێ: حەزناکەم ببینــم! بۆیە دەیگوت: پێــم وتووە بێت بۆ لات. بەڵام نازانم

بۆچی نایەت؟!. تا دوای چەندین جار، ئەم پزیشکە پەککەوتە تێگەیشت کە ژنەکەی ئیتر ئامادە نی یە لەلای بێت و تەنانەت گوێ ی لە قســەی زۆر ســاردو ســوك بوو، کە ژنەکەی پێ ی دەوت و بێزاری خۆی لەم پەککەوتەیە دەردەبڕی!

بەڵێ ئەم پزیشــکە ماوەی هەشت ساڵ بەم شێوەیە مایەوە. تەواوی ئەو هەشــت ساڵە تەنها ئەو کەسەی بە مانگانە وەکو خزمەتکار بەکرێیان گرتبوو. خواردن و خواردنەوەی دەدایەو پاکی دەکردەوەو بۆ یەك جاریش ژنەکەی و منداڵەکانی نەچونە لای قسەیەکی لەگەڵ بکەن.

نەك هەر ئەوە بەڵکو لە ئەنجامی ئەو بۆگەنە ناخۆشەی کە لەلاشەی دەهات و لە هەورەبانەکەوە بۆ ناو ماڵەکە دەگەڕایەوە. ژنەکەی بڕیــاری دا ئەو بۆگەنە لەماڵەکەی دوربخاتەوەو ئەم خانوە پاك و بۆنخۆشە بەم بۆگەنیە پیس نەبێ، بۆیە لەدوری ماڵی خۆیان خانویەکی بۆ بەکرێ گرت و لەگەڵ خزمەتکارەکە ناردیــە ئــەوێ!.. بەڵێ هەر ئەو خانوەی کە ئەم پزیشــکە بە ڕەنجی چەند ســاڵەی و پارە کۆکردنەوەی لە ژنانی نەخۆشی هەژار دروستی کردبوو. ئێستا لێ ی دەکرێتە دەرەوەو نایانەوێ بە بۆنی لاشــەی و ناڵەناڵی شــەوانی لەبەر ئــازار، هێمنی و پشوویان لێ تێك بچێ!!..

سبحان الله ئـەو دکتـۆرەی بەزەیـی بەژنێکی هـەژاردا نەدەهاتـەوەو فەڕشـی ژێـر نەخۆشـەکەی پێ فرۆشـتن بۆ وەرگرتنی لیرەیەك، ئەم دکتۆرە خۆپەرستە ئەنانی یە، بەوەی کـە دەیزانی غەیری ئەو دکتۆری تـر نی یە تا خەڵکی بچنە لای. ئاوا خەڵکی نەخۆشـی زەلیل دەکـرد ، خوای گەورە ئاوا زەلیلی کرد.. ئاوا ئەو کۆشك و تەلارەی کە بەو پارانە دروستی کرد، بوو بە حەسـرەت و داخ و مـەراق و ژوریکیان پێ ڕەوا نەبینی و سەرەنجام هەورەبانەکەشیان پێ ڕەوا نەبینی کە بە نەخۆشی تێیدا بژی!

هەر ئەو ژن و منداڵەی بۆ ئەوان پارەی کۆدەکردەوە. هەر بە ئـەوان لە ماڵەکەی کرایە دەرەوەو هەر بەو پارەی کە خەڵکی پـێ زەلیل دەکرد، خـوای گەورەش زەلیلی کـردوو کردی بە پەندو عیبرەت بۆ هەرکەسێ پەند وەرگرێ.

بەڵـێ ئیمانداران: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەم دوعایە فێری ئەوەمـان دەکات کـە هەرگیز ئەنانی و خۆپەرسـت نەبین و وانەزانین کە ئەوەی هەمانە هی شەهامەت و ئازایەتی و دلێری و بوێری خۆمانە. بەڵکو هەمووی هی خوای گەورەیەو ئەمانەتەو بـۆ تاقیکردنەوەیە، ئەگەر بۆ کەمتر لـە چاوترووکانێ لوتفی خوامـان لەگەڵ نەبێ تیادەچین. پێغەمبەری خۆشەویسـتمان

(ﷺ) دەیفەرمــوو: (اللهُمَّ لا تَكِلْني إِلى نَفْسِـي طَرْفَةَ عَـيْنٍ، وَلا أَقَلَّ مِن ذلكَ).

خوایــە گیان بــۆ چاوتروكانێك و كەمتــر لەچاوتروكانێك نەمســپێری بە خۆم. چونكە لەو ماوە هەرە كەمەشدا ناتوانم بەكەڵكی خۆم بێم و فریای خۆم بكەوم.. بەڵێ (صَدقْتَ وبَرَرْتَ وَبالحَقِ نَطَقْتَ) ئەی پێغەمبەری خۆشەویستمان. بەڕاستی ئەگەر بۆ كەمتر لە چاوتروكانێك لوتف و ڕەحمەت و چاودێری خوای پەروەردگارمان لەگەڵ نەبێ تیادەچین و ســەرگەردان دەبین. ژیانمان دەبێت بە ژان و تیاچون و لەناوچون..

باگوێ بگرین بۆ پزیشــك و مامۆســتای زانكـۆ بانگخوازی بەناوبانگــی ســوری (د. محمــد راتــب النابلســی) كــە ئــەم بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ:

گەنجێــك، لاوێكــی زۆر پێكەوتوی، بالآبــەرزی، ڕێكوپێكی زیرەك. كــە خوێنــدكاری قۆناغی چواری كۆلێجی پزیشــكی بوو، لە زیرەكترین خوێندكارانی بەشەكەی بوو، لەهەموشیان جەستەی ساغ و تەندروست تر بوو، لە هەمویان نەرم و نیان تر بوو، ڕۆژێكیان كت و پڕ لەناو پۆلدا هەستی كرد جەستەی گەرم داهات و بێ هێزی و بێ تاقەتی ڕووی تێكرد، بەرەبەرە لەشــی بێ هێزو بێ توانا دەبــوو، دەم و چاوی زەرد هەڵگەڕا،

ئیتر چوو بۆلای پزیشـــك و دەستی كرد بە پشكنینی خوێن و چەوری و فشاری خوێن و ئەمانە.

دكتۆری یەكەم پێی ووت: بەپێ ی شـــیكاری نەخۆشیەكەت بێ، توشـــی كەم خوێنی بویت. بەڵێ بـــەوە قەناعەتی نەكرد، ئاخـــر گەنجێك لە هەڕەتی لاویەتی و چوســـت و چالاكی داو، لە خێزانێكی دەوڵەمەندو خۆشـــخۆرو خۆشحاڵ. بەچی توشی كەم خوێنی دەبێ؟! بۆیە چووە لای پزیشكی دووەم و ئەویش كۆمەڵێ پشـــكنینی بۆ نوسی و سەرەنجام گەیشتنە ئەوەی كە لە ســـپڵیدا چالاكی زیاد لە پێویســـت هەیـــەو بۆتە هۆی ئەم بێهێزی و لاوازیەی!!

بەڵێ سپڵ وەكو كارگەیەكی یەدەگی (احتیاط) وایە لەلەشدا بۆ دروست كردنی خڕۆكەی خوێن. وە هەروەها گۆڕستانێكیشە بـــۆ ئەو خڕۆكانەی كەدەمـــرن. چونكە لە تەنها یەك چركەدا لەناو جەســـتەی مرۆڤدا (دوو ملیـــۆن و نیو) خڕۆكەی خوێن دەمرێـــت!! جـــا ئەم خڕۆكانە كـــە دەمـــرن، دەگوازرێنەوە بۆ گۆڕســـتانی سپڵ، ئەمجا لەناو ســـپڵداو بەرێگایەكی ئابوریانە، ئـــەم خرۆكە مردوانە دەشـــكێن و دەڕوخێن و دەگەڕێنەوە بۆ ئەصڵی پێكهاتنی ســـەرەتایان!! (چۆن مرۆڤ لە خاك دروســـت بـــووەو كە مـــرد دەبێتەوە بە خاك و خۆڵ) ئـــەو خڕۆكانەی

خوێنیش لەقەبرســتانی سپڵدا، ئاوا دەبنەوە بە ئەو پێکهاتەی کــە یەکەم جار لێی دروســت بوون. کە بریتیە لە: (ئاســن و هیمۆگلۆبین). ئاسنەکە یەکسەر دەچێتەوە بۆ کارگەی خڕۆکە سورەکانی خوێن کە لەناو مۆخی ئێسقاندایە بۆ ئەوەی جارێکی تر ببێتەوە بە خڕۆکەی سوری خوێن! هەروەها (هیمۆگلۆبین) ەکــەش دەچێتــەوە بۆ جگەر بــۆ ئــەوەی زەرداوی زراوی لێ دروســت ببێتەوە!! {بــۆ زانیاری: ئەگەر مرۆڤێك (٧٠) ســاڵ بژی. مۆخی ناو ئێســقانەکانی لاشەی ئەو ئادەمیزادە هێندەی قورســایی (٦٥٠) کلغم خڕۆکەی سورو، (١٠٠٠) کلغم (یەك تەن) خڕۆکەی سپی دروست دەکەن!! ئەمە لە کاتێکدا کێشی هەموو مۆخی ناو ئێسقانی ناو لاشەی مرۆڤ یەکسانە بە (٢٦٠٠) غرام!!! وە بزانن: هەموو خڕۆکەیەکی ســوری نــاو خوێنی ئادەمیزاد (دوو سەدو حەفتا ملیۆن) وردیلەی هیمۆگلۆبینی تێدایە!..}.

بەڵــێ بەڕێــزان: پارچەیەك لە ســپڵی ئــەم گەنجەیان بۆ پشکنین نارد بۆ یەکێ لە وڵاتە پێشکەوتوەکانی خۆرئاوا.

دوای پشکنینێکی زۆر ورد، ئەمە ئەنجامی ڕاپۆرتی پزیشکی بــوو: (ئەم ســپڵە سیســتمی کاری تێکچووەو زیــاد لەوەی بۆی دانراوە کاردەکات و ئەو خڕۆکە ســورانەی کە مردون وەریان دەگرێ و شــیان دەکاتەوە بۆ پێکهاتە ســەرەتاییەکانی خۆیان،

کە ئەمە ئیشی خۆیەتی و زۆر باشە ـ بەڵام ئەم سپڵە ئەوەندە چالاك کاردەکات کە: خڕۆکە سورەکانی خوێن کە تازە دروست دەبن، ئەوانیش بۆلای خۆی ڕادەکێشێ و دەیانمرێنی و شییان دەکاتەوە!!! ئیتر بەهۆی ئەم کارەی سپڵەوە کە ئیشی ئەو نیەو بە زیادە چالاکی خۆی دەیکات ـ ناهێڵێ خڕۆکە سورەکە سوڕی ژیانی تەواو بکات و بمرێ و بەمردویی بێ بۆ سـپڵ، سپڵەکە خـۆی دەیمرێنێ و شـی دەکاتەوە، ئەمـەش دەبێتە هۆکاری ئەوەی کە هەمیشە ئەم کوڕە گەنجە خوێنی کەم بێ و توشی کەم خوێنی بووە!!). بەڵێ هەرچی دەرمان و چارەسـەر هەبوو کردیان، بەڵام نەیان توانی ئەم سـپڵە بخەنەوە دۆخی ئاسایی خۆی و سەرەنجام دوای ماوەیەك پێی مرد!!.

غەیری ـ الله ـ سبحانە وتعالی. کێ هەیە بتوانێ بۆ کەمتر لەچاو تروکانێ ئاگاداری سـپڵت بێ و نەهێڵێ لەو کارەی بۆی دیاری کراوە زیاتر کار بکات؟! هیچ کەس!

دەی کە ئاوا بەهێزو بەگـوڕی، گەنجی، زیرەکی، بەتوانای، لاشەت بەهێزە، هی خۆتە یا هی لوتف و کەرەمی خوایە؟ بێ گومان هی خوایە، کەواتە: ئەم خۆپەسەندیەت لە چی؟!.

بەراسـتی شـەرمەو شـەرمەزاریە مرۆڤ ئاوا بێ دەسـەڵات بێ بەرامبـەر هـەر گۆڕانکاریەکی ناو لاشـەی خۆی کـە دەبێتە هۆی

پەککەوتنــی و ســەرەنجام مردنی، کەچی هەربڵــێ: من وام و من وامکردو من نەبم ژیان نابێ و خەڵکی هەمووی موحتاجی منن!!.

خــوای گەورە بــە ڕەحمی خۆی ڕەحممان پــێ بکات و لە خۆپەســەندی بمانپارێــزێ و خواناس بیــن و خۆناس بین.. ئامین.

وصَلّى الله وسـلّم على سـيّدنا محمد وعلى آلـه وصَحْبِه أجمعين. وآخِرُ دَعوانا أنِ الحمدُ لله ربِّ العالمين..

## سەرچاوەکان:


١. قورئانی پیرۆز. تەفسیری ئاسان.

٢. نداءات الرسول لأصحابه، محمد عبدالعاطي بحيري. ج١، ص٣٦٩- ٣٧٩.

٣. خُطب الشيخ عبدالحميد كُشك. ج٨، ص٢٧.

٤. موسوعة الأسماء الله الحسنى. د. محمد راتب النابلسي. ج١، ص١٤٣،١٥٢،١٥٤.

٥. گۆڤاری دوانگە. ژ: ٣٢-٣٣.

# بەشی دووەم

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمين والصَّلاة والسَّلام عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدْ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعين.

ئەنانی واتە: زیادەڕەوی لە خودپەرستیدا، حەزکردن بەوەی خۆت ببیتە خاوەنی هەموو شتێك. مرۆڤی خودپەسەند ئەگەر کەسێك بووە هاوبەش و هاوەڵی لە دەسکەوتەکانیدا، هەست بە دوودڵی و ڕاڕایی دەکات. خودپەسند بەرژەوەندی خۆی دەخاتە سەرو بەرژەوەندی هەموو خەڵکیەوە. لە پێناوی بەدیهێنان و هێنانەدی دەسکەوتەکانیدا گوێ بەزەرەرو زیان و هەستی کەسانی دی نادات. بەکورتی؛ هەموو شتێکی بۆ خۆی دەوێت. جا بۆ ئەوەی بزانی تۆ کەسێکی ئەنانی و خۆپەرستی، ئەوا لە خۆت بپرسە و بزانە ئایا:

کاتێك کەسانی دەوروبەرت دوچاری ناڕەحەتی و ناخۆشی دەبن، گرنگی بە دڵنەواییان دەدەیت یان نا؟!

ئایا کاتێ هەڵەت کرد داوای لێبوردن دەکەیت یان نا؟.

ئایا هاوڕێکانت بە قسـە کردن لەگەڵتدا دڵخۆش و شادمان دەبن یان نا؟.

ئایا زۆر جار قسە لەگەڵ خودی خۆت دەکەیت؟ ئایا هەوڵ دەدەیت هەموو ڕێگەیەك بەکار بهێنیت بۆ ئەوەی دەوروبەرت بە بۆچونەکانت ڕازی بکەیت (ئەگەر وابیت ئەنانیت).

ئایـا ڕێز لـە هـەوڵ و ماندوبونی کەسـانی دی دەگریت؟ (ئەگەر دەیگریت ئەوا ئەنانی نیت).

ئایا خۆت بەکەسـێکی دانـاو خاوەن ئەزمـوون دەزانیت؟ (ئەگەر وابیت ئەنانیت).

ئایا حەز بەکاری خۆبەخشـی دەکەیت؟ ئایا بە هاوکاری و یارمەتیدانی دەوروبەرت خۆشـحاڵ دەبیت؟ ئەگەر وەڵامەکەی بەڵێ یە، ئەوا تۆ دوریت لە ئەنانیەت..

ئایا کاتی دەوروبەرت ڕەخنەی بنیاتنەرانەی دڵسۆزانەت لێ دەگرن هەسـت بەنیگەرانی دەکەیت؟ ئایـا لەو باوەڕدایت کە هەمیشە بۆچونی تۆ ڕاست و دروستە؟ ئەگەر وەڵامەکەی بەڵێ یە، ئەوا بزانە نیشانەی ئەنانیەتت تێدایە..

جا ئەگەر کەسێکی ئەنانیت، دەتوانیت بەخۆتدا بچیتەوەو هەوڵبدە ببیتە کەسێکی خۆشەویست لەلای خەڵکی، دوربکەوەوە لە خودپەسندی، کاربکە بۆ بەختەوەری دەوروبەرت، متمانەت

بــە تواناکانی خۆت هەبێت، دڵنیابە ئەگەر بتەوێت دەتوانیت خۆت بگۆڕیت.

ئیمانــداران: پێغەمبەری خۆشەویســتمان (ﷺ) هەمیشــە هاوەڵانــی ئامۆژگاری دەکرد لەوەی کە توشــی ئەنانیەت ببن. تەنانــەت ئــاگاداری دەکردنەوە کە خۆیان لە وشــەی (أنا) ش بپارێزن.

بۆ نموونە: جارێکیان کەســێك لە دەرگای ماڵی پێغەمبەری خوای دا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: کێ یە؟ کابرا ووتی: منــم (أنا)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەمە چی یە (أنا، أنا)، بۆ ناوی خۆت ناڵێ ی. وەکو ئەوەی پێ ی ناخۆش بێت کە ئەو کەسە بڵێ (أنا). چونکە (منم) وەکو ئەوە وایە کەسێك زۆر خۆی بە کەسێکی ناودارو ناسراو بزانێ، وە وابزانێ هەموو کەس ئەو دەناسێ. بۆیە چاکتر وایە مرۆڤ ناوی خۆی بڵێ و بەمەش دوور دەبێت لە ئەنانیەت و خۆپەرستی و خۆپەسەندی..

بەرێــزان: خوای پــەروەردگار - ســبحانە وتعالــی - بەبەجێ هێنانی کرداری فێری ئەوەمان دەکات کە دوربین لە ئەنانیەت و خۆپەرستی. دەفەرموێ: هەرگیز بڕیارمەدەو مەڵێ حەتمەن من وادەکەم و وادەڕۆم و ئەو ئیشە ئەنجام دەدەم. بەڵکو بڵێ: ئەگەر خوا وویستی لەسەر بێ وادەکەم. بەم شێوەیە خۆت لە ئەنانیەت

و خۆبەشت زانین دەپارێزی. ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْيْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴾ الكهف: ٢٣ — ٢٤.

سبحان الله. مرۆڤ هەرکات ووشەی (إن شاو الله)ی بەکارهێنا، یەکسەر لە خۆپەرستی و ئەنانیەت دەپارێزرێ و ئەو غەریزە خراپەی ئەنانیەتی لە دەرون دەچێتە دەرەوە..

بەرێزان: تەماشاکەن. تۆی مسوڵمان لەناو نوێژەکەتدا دەڵێ ی: ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾ ناڵــێ ی (إيــاك أعبــد وإياك أستعين) خۆت جیا ناکەیتەوە لە کۆمەڵی مسوڵمانان.. جارێکیان ئەعرابیەك کە تازە مسوڵمان ببوو هاتبوە شاری مەدینە، ڕوی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کردو ووتی: (اللَّهُمَّ ارْحَمْني وَمُحَمَّدًا وَلَا تَرْحَمْ مَعَنَا أَحَدًا) رواه البخاری (٦٠١٠).

خوایە گیان تەنها ڕەحم بەمن و محەمەد بکەیت، وە ڕەحم بەکەســی تر مەکە لەگەڵ ئێمەدا. هــەر ڕەحم بەم دوانەمان بکــە! بەڵێ ئەمــە ئەنانیەتە کە حەز بکەی خــوا جگە لەتۆ ڕەحم بەکەسی تر نەکات. بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەکسەر لێ ی هاتە دەنگ و ئەم هەڵەیەی بۆ ڕاست کردەوەو فەرمووی: (لَقَدْ حَجُرْتَ وَاسِعًا). بەڕاستی ڕەحمی فراوانی بێ سنوری خوای گــەورەت بچوك و بەرتەســك کردەوە! بڵــێ خوایە ڕەحم بە ئێمەش و بە هەموو مسوڵمانان بکەی.

ئەگەر ئەو خەڵکە هەمووی بچنە بەهەشــت بەڕەحمی خوا چی لە ئێمە کەم دەبێتەوەو چی لەبەشــی ئێمە لە بەهەشــتا دەدرێ بەکەســانی تــر؟! ئەگەر خەڵکی هەمــوو بچنە دۆزەخ ئێمە چی قازانجێك دەکەین؟!

بەڵــێ ئەمڕۆ ئەنانیەتــی ئەو ئەعرابیە لــە زۆر کەس لە مســوڵمانانـدا ڕەنگی داوەتەوە. تەماشا دەکەی ئەگەر بۆ خۆی توشــی خێرو خۆشــیەك بوو، بە بێ ئەوەی هیچ لەخۆی کەم ببێتەوە، حەز ناکات ئەو خەڵکەش توشــی ئەو خێرو چاکەیە ببــن، ســودمەند ببن لــەوەی ئەم لێی ســودمەند بووە، حەز دەکات کەس پێی نەزانێ!!..

بەڵێ ئەمڕۆ فیکرەی ئەو ئەعرابیە ئەنانیە، خۆپەســەندە دەکــرێ بەکردار، کاری بۆ دەکرێ، بەرنامــەی بۆ دادەڕێژرێ. جــاران خەڵکــی تەنها مســوڵمان بوون بەس بــوو بۆ ئەوەی بیــان بەســتێتەوە بەیەکەوە، کەچی دوژمنانی ئیســلام هاتن ئەهلی ئیسلامیان دابەشکرد بۆ سەر بیری نەتەوەپەرستی (کە نەتەوەپەرستی جیاوازە لە سۆزی نەتەوایەتی).

ئەوەتا تورك دەڵێ: هەر من هەم. ئەتاتورك نوێژو بانگیشی کردبــوو بە تورکی، دەیگوت: جگە لە زمانی تورکی هیچی تر هیچ نیە!.

عـــەرەب دەڵێ: غەیری عەرەب هەر بۆ خزمەتکاری باشـــە، ئێمە سەییدو گەورەی خەڵکین!.

فارس لەولاوە دان بەکەسدا ناهێنێ.

کوردیـــش بـــۆ بەرپـــەرچ دانەوەیـــان دەڵێ: جگە لـــە کورد نابـــێ هیچ نەتەوەی تر هەبێ. (کورد تا ئێســـتا نەچۆتە قاڵبی نەتەوەپەرستیەوە، تەنها سۆزی بۆ نەتەوەی خۆی هەیەو دەڵێ با منیش هەبم، هەروەکو ئەو گەل و نەتەوانەی تریش هەن).

ئەمجا دوای ئەوە خەڵکی مســـوڵمانیان دابەشـــکرد بەســـەر شیعەو سونەدا، پاشان دابەشکردن لەسەر ئاستی ناوچەگەری و تایەفەگەری! بۆنمونە:

ئێمەی میللەتی کورد ماوەیەکی زۆر وابەستە بوین بەیەکەوە لەســـەر بنەمای ئەوەی کە کوردین و مســـوڵمانین، هاوزمان و هاوئاینین. دوای ئەوە ئەویش گۆڕا بۆ کوردایەتی دابەشـــکردن لەســـەر بنەمای ئەمـــلاولا، بادینی و ســـۆرانی. ئەویش وردتر بۆوە، ئێســـتا گەیشـــتۆتە ئەوەی هەرگونـــدەو خۆی دەردەخاو خۆی ڕادەنوێنێ و خۆی زاڵ دەکات بەسەر گوندەکانی تردا.

ئەمـــڕۆ ڕۆژی گوندی فلانـــە، خەڵکینە وەرن بۆ ســـەیران بـــۆ ئەوێ.. گوندەکەی تر لەڕقی ئـــەو خەڵکی زیاتر لە ڕۆژی گوندەکەی خۆیدا کۆدەکاتەوە.

لەوەش وردتر بۆوە. ئێستا لەسەر ئاستی عەشرەت و بەرەباب و تیرەگەری، فیستیڤالی فلان عەشرەت و تیرە هەیەو سەنتەری ڕۆشنبیری هەیەو خۆی ڕادەنوێنێ و هێزو دەسەلاتی خۆی دەردەخات. کە بەڕاستی ئەمە سەرەتایەکی خراپە بۆ لێك ترازانی کوردو هۆیەکەشی هەموی هەر ئەنانیەت و خۆپەسەندی یە.

بەلێ ئیمانداران: پێغەمبەری سەروەرمان (ﷺ) هەمیشە دوور بووە لە هەر نیشانەیەکی خۆپەسەندی و ئەنانیەت و خۆجیاکردنەوە لە هاوەلانی و سەرجەم خەلکی.

صەحابەکان دەفەرموون: پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەلە جل و بەرگیدا، نەلە مێزەرو کولاویدا، نە لە پێلاو نەعلیدا، نەلە شوێن و دانیشتنی لە مەجلیسدا، نەلە قژو ڕیش و سمێلدا، هیچ جۆرە جیاوازیەکی لەگەل هاوەلانیدا دروست نەکردبوو بۆ خۆی. بۆیە کاتێ کەسێکی غەریب لەدەرەوەی مەدینە دەهاتە شاری مەدینەو تا ئەوکاتە پێغەمبەری خوای (ﷺ) نەبینیبوو، کەدەهاتە مەجلیسی پێغەمبەرەوە (ﷺ) سەیری خەلکەکەی دەکرد، بۆی دەرنەدەکەوت کامە پێغەمبەری خوایە، چونکە وەکو پاشاکان کورسی تایبەتی نەبوو لەسەرووی مەجلیسەوە. بەلکو شوێنی تایبەتیشی نەبوو بۆ لێ دانیشتن، کەدەهاتە

کــۆڕی دانیشــتنی هاوەڵانی، کــویێ چۆڵ بوایە دەچــوو لەویێ دادەنیشــت. وەلە جل و بەرگیدا هیچ نیشــانەیەکی جیاوازی پێوە نەبوو، بۆیە کەســە غەریبەکە دەیپرســی: ئەری کامتان محمد پێغەمبەری خوایە (ﷺ)؟!.

بەم شێوەیە، بەم سادە ژیانەو خۆ جیانەکردنەوە لە خەڵکی، مرۆڤ لە ئەنانیەت دەپارێزرێ. چونکە سروشــتی مرۆڤ وایە (إلا ما رحم ربي) کە تەماشای کرد ئەوەی ئەم هەیەتی خەڵی تر نیەتی، ئەو جل و بەرگەی لەبەر ئەمدایە، بە هەموو کەس ناکڕدرێ، ئەو خانوەی ئەم هەیەتی لەناو گەڕەکەکەدا بە پەنجە ئاماژەی بۆ دەکرێ بۆ گرانبەهایی و ڕازاوەیی و جوانکاری. ئەو ئوتۆمبیلەی کە لەژێریایەتی لەهەرە گرانبەهاکانەو سفرە.

کاتێ ئاوا خۆی دەبینێ، لە ناخیا ئەنانیەت و خۆپەسەندی دروســت دەبێ و وادەزانێ ئەم هاوشــانی خەڵکــی نیەو دیارە لەوان گەورەترە بۆیە وایە!!

بۆیە واباشە مرۆڤ ئەگەر خوای گەورە ئەمانەی پێ بەخشی هەمیشــە یادو زیکری خــوا بکات. ئەو ویردانــە بخوێنێ کە پێغەمبــەری خوا (ﷺ) بۆ ناو چونەماڵەوەو ناو ئوتۆمبێل و جل و بەرگ لەبەرکردن نان خواردن و خەوتن و هەڵسان بۆی دیاری کردوین. کە مرۆڤ وا لێدەکەن هەمیشــە خوای گەورەی

لەیاد بێ و ئەم شتانەی کە هەیەتی بەخەڵاتی پەروەردگاریان بزانێ، نەك ئازایەتی و شەهامەتی خۆی!..

بەڵێ ئیمانداران: هەرکــەس ئەنانیەت بەکار بهێنێ و هەر بڵێ: من، من. ئەوا بەدەردی (نەمرود) دەچێ. نەمرودی پاشای ستەمکار دەیگوت: ﴿قَالَ أَنَاْ أُحۡيِۦ وَأُمِيتُۖ﴾ البقرة: ٢٥٨.

من خەڵکی دەژیەنم و ژیان بەخەڵکی دەبەخشــم و ئەوەی بمەوێ بژی نایگرم و نایکوژم، ئەوەش بمەوێ دەیمرێنم و لە سێدارەی دەدەم و کەس ناتوانێ ڕزگاری بکات.

دەفەرمون با بچینە خزمەت قورئان و تەواوی بەسەرهاتەکە بخوێنینــەوە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِي حَآجَّ إِبۡرَٰهِـۧمَ فِي رَبِّهِۦٓ أَنۡ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلۡمُلۡكَ إِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّيَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ قَالَ أَنَاْ أُحۡيِۦ وَأُمِيتُۖ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأۡتِي بِٱلشَّمۡسِ مِنَ ٱلۡمَشۡرِقِ فَأۡتِ بِهَا مِنَ ٱلۡمَغۡرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِي كَفَرَۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ البقره: ٢٥٨.

واتە: ئایا نەتبیستووەو نەتڕوانیوەتە ئەو کەسەی دەمەقاڵەی دەکــرد لەگەڵ ئیبراهیمــدا لەبــارەی پەروەردگاریەوە لەبەر ئەوەی خوا پادشــایەتی پێ بەخشیبوو، (لەجیاتی باوەڕهێنان و سوپاسگوزاری کەچی دەمەدەمێی دەکرد لەگەڵ ئیبراهیمدا). ئەم لوتبەرزیەشــی کاتێك بوو بە هەواو فیزەوە پرســیویەتی

لــە ئیبراهیم کە پەروەردگاری تــۆ کێ یە؟ ئەویش لەوەڵامدا ووتــی: پەروەردگاری من ئەو زاتەیە کە ژیان دەبەخشــێت و مردنیشی بەدەستە. نەمرود لە وەڵامیدا ووتی: جامنیش ژیان دەبەخشــم و مردنیشم بەدەســتە، ئەمجا فەرمانیدا هەندێك لەنەیارانی بکوژن – گوایە ئەوە دەیانمرێنێت ـ هەندێکیشــی نەکوشــت ـ گوایە ئەوە ژیانی پێبەخشــین!! ـ ئەوسا ئیبراهیم ووتی: بەڕاستی خوا خۆر لە ڕۆژهەڵاتەوە دەهێنێت، جا ئەگەر تــۆ دەتوانیت لە ڕۆژئاواوە بیهێنە. ئینجا ئەو بێباوەڕە ڕەنگی پــەڕی و دەمکوت کراو وەڵامــی نەما. بێگومان خوا هیدایەتی گەلی زاڵم و ستەمکار نادات..

چەند سەرنجێك لەسەر ئەم ئایەتەو گفتوگۆی نێوان سیدنا ئیبراهیم و نەمرودی ئەنانی، خۆپەسەندی، ستەمکار:

١. خــوای گــەورە دەفەرمووێ (أَلَمْ تَـرَ) لــەڕوی قەواعیدی زمانی عەرەبیەوە (أَلَمْ تَـرَ) پێك هاتووە لە سێ شت، ئەوانیش (أ) هەمزەی ئیســتیفهام. لەگەڵ حەرفــی نەفی (لم)، هەروەها فیعلــی مەنفی (تــر). جا ئەوەی شــارەزای زمانی عەرەبی بێ دەزانــێ کە (أ) لیرەدا بۆ ئینکاری کردنە (والإنكارُ نفيٌ بتقريع). هەروەکو کەسێك بە کوڕکەی بڵێ: أتضرب (أباك؟!). ئەوە تۆ لە باوکت داوە؟! لێرەدا هەمزەی ئیستفهام بۆ پرسیارکردن نیە تا

بزانــرێ ئــەو کوڕە لە باوکی داوە یان نا، بەڵکو بۆ ئینکاری و ئیدانەی ئەو کردارە ناڕەوایەیە.

جـا لێرەدا هەمزە چۆتە ســەر فیعلی مەنفی، کەواتە بۆتە (نفی النفی) نەفی نەفیش بۆ ئیسپاتە..

ئالێــرەدا فەرموودەی خوای گــەورە ( أَلَمْ تَـرَ ) بەمانای (أنت رأیــت) تۆ ئەی محمد، ئەی ئیماندار بینیت.. جا لێرەدا ئەگەر یەکێ پرسیار بکات، باشە بۆچی خوای پەروەردگار ڕاستەوخۆ نەیفەرموو (أرایت؟). بۆ وەڵامی ئەو پرســیارە دەوترێ: خوای گەورەو کاربەجێ ئەم مانایەی بەشــێوازی (نفــي النفي) هێنا، بۆ ئەوەی ماناو مەبەســتەکە چاکتر لە دەرونی گوێگردا جێ بگــرێ، چونکە هێنانی بابەتێك بەشــێوازی (إثبـات) بە تەنها شــێوازی تەڵقین و ڕێنمایی کردن دەبەخشــێت، جا کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت ( أَلَمْ تَـرَ ) باشــە خۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەمرودی نەبینیوە، کەواتە ( أَلَمْ تَـرَ ) بەمانای (أنت رأیت) دێت..

لێرەشدا یەکێ دەپرسێ: ئەی بۆچی پەروەردگار ڕاستەوخۆ نەیفەرمــوو (ألـم تعلم)، وەڵامی ئەو قســەیەش ئەوەیە: خوای گــەورە هەواڵێکی پێداویــن و پێڕاگەیاندویــن، ئێمەش وەکو ئیمانداران لەسەرمان پێویستە کە ئەوەندە یەقینمان بەڕاستی

ئەو هەواڵە هەبێ، هەروەکو بەچاوی خۆمان بینیبێتمان وابێ.

بۆچی؟!

چونکە ئەگەر چاو یەکێك لەهەســتەکانەو دەکرێ فێڵی لێ بکرێ، بەڵام پــەروەردگار هەرگیز فێڵی لێ ناکرێ، وەهەرگیز ناخەڵەتێنــدرێ. دەی کەواتە لێــرەدا (أَلَمۡ تَـرَ) بەمانای: (ألمْ تعلَمْ عِلْمَ اليقينِ بأنَّ هُناكَ رَجُلاً قَدْ حَاجَّ إبراهيم في رَّبهِ؟).

٢. بەکارهێنانــی حەرفــی (إلى) لە ئایەتەکەدا بۆ ســەرنج ڕاکێشــانمانە کەڕوداوێکــی سەرســوڕهێنەرو ســەرنج ڕاکێش ڕویداوە.

٣. لە ئایەتەکەدا ســەرنج بــدەن (إبراهيم) مەنصوبە (حَآجَّ إِبۡرَٰهِـۧمَ). کــە ئەمەش ئەوەمان بۆ ئاشــکرا دەکات کە نەمرود دەســت پێشــکەر بوو، کە دیارە نەمرود بە سیدنا ئیبراهیمی ووتووە (من ربُّك؟) کێیە پەروەردگاری تۆ؟! ئەمجا ئیبراهیمیش وەڵامی داوەتەوە.

٤.خوای گەورە خســتیە سەر زمانی سیدنا ئیبراهیم، کە لە وەڵامــی نەمروددا فەرموی: (رَبِّيَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ). باشــە بۆچی ئیبراهیم ئەم حوجەو بەڵگەی نیشــاندا؟ چونکە هیچ کــەس زات و جورئەتــی ئەوە ناکات کە بڵــێ من توانای ژیان بەخشین و مردنی خەڵکیم هەیە. بەڵام نەمرود هێندە لەخۆ

ڕازی بوو، کە خۆی بە خوا دادەنا. بۆیە وتی: ﴿أَنَا۠ أُحۡيِۦ وَأُمِيتُۖ﴾. وشـەی (أنا)ی بـەکار هێنا وەکو ئەنانیەت و خۆپەسـەندی و لەخۆ ڕازی بوون و بەدەسـەڵاتی خۆ نازین. سـیدنا ئیبراهیم ووتـی: چۆن؟ ووتی: من لە گرتوخانەکەمـدا زیندانیم هەن، فەرمان دەکەم هەندێکیان بکوژن و هەندێکیان ئازاد بکەن. جا ئەوەی من نەمکوشـت و ئازادم کرد وەکو ئەوە وایە کە ژیانم پێ بەخشـی بێ!! ئەوەش کە فەرمانمـدا بیکوژن، ئەوە وەکو ئەوە وایە من مراندبێتم!!

بەڵام سەرنج بدەن. سیدنا ئیبراهیم نەهات لە وەڵامی ئەم قسـەو بەڵگە پـوچ و بەتاڵ و بێ بنەمایـەدا بفەرموێ: ئەی نەمرود وەرە باجارێ من و تۆ قسە لەسەر ئەوە بکەین کە ژیان و مراندنی ڕاسـتەقینە چۆنە! ئەی نەمرود تۆ دەتەوێ مردن و کوشتن بکەی بەیەك شت، لە کاتێکا ئەو کەسەی کە دەمرێ هیچ لێدان و هەڵواسین و سەرپەڕاندن و ئەشکەنجەو نەخۆشی و پیـری بەرناکەوێ و توش نەبووە. لە ئەپەڕی گەنجیەتی و لەش سـاغی و ئیسراحەت و خۆشخۆری و سەرجێگای نەرم و ژینگـەی پاکدا بەلادا دێ و هیـچ دکتۆرو دەرمانێ ناتوانێ لە مردن ڕزگاری بکات. ئەمە مردنە، بەڵام تۆ کوشتن بە مراندن دادەنێی!!

هەروەها ژیان بەخشین ئەوەیە شتێ ڕوحی لەبەرنیە ڕوحی بەبـــەردا بکرێ. نەك خۆی ڕوحی لەبەرەو دەژی تۆ بەوەی لە زیندان ئازادی دەکەی وابزانی ژیانت پێ بەخشیوە! ئەمە ژیان ڕزگارکردنە نەك ژیاندن.

بەڵێ ســـیدنا ئیبراهیم ئەمانـــەی لەگەڵ نەمرود نەگوت و ئەم جەدەل و مناقەشەی لەگەڵ نەکرد، بەڵکو یەکسەر چوو بۆ بەڵگەیەکی تـــرو فەرمووی ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأْتِي بِٱلشَّمْسِ مِنَ ٱلْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ ٱلْمَغْرِبِ ﴾.

واتـــە: ئـــەوە لەبەرچـــاوی هەمومانە کە خـــوای من خۆر لەڕۆژهەڵاتەوە دەهێنێت. جا ئەگەر تۆش خوای وەرە خۆر لە خۆرئاواوە هەڵبهێنەو با ئەو خەڵکە بیبینن! ئالێرەدا ﴿ فَبُهِتَ ٱلَّذِي كَفَرَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾. ئەمجـــا ئەو بێباوەڕە ڕەنگی پەڕی و دەمکوت کراو وەڵامی نەما..

(لـــە زمانی عەرەبیدا: البُهْتُ يأخـــذُ ثَلاثَ صُور: الدَّهشَـــةُ أوَّلاً، ثـــمَّ الحـــيرَةُ ثانياً، ثمَّ الهَزيمَةُ ثالثاً). بەڵێ ئەمە باســـی نەمرودی ئەنانی و ستەمکار بوو.

نەمـــرود کێیە؟! پاشـــایەکی دیکتاتۆرو ملهـــوڕو خۆبەزلزان و لوتبەرز بوو، خۆی پێ خودا بوو، کۆشکی بەرزی دروست کرد بەرەو ئاسمان دەیڕوانی و دەیگوت: دەچم خوا لە ئاسمان دەکوژم!!

مێژوونوســان دەڵێن: چوار پاشــا توانیویانە هەموو دونیا بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە هەر لە ڕۆژهەڵاتەوە تا ڕۆژئاوا دەستیان ڕۆیشتووە، ئەو پاشایانەش ئەم چوارەن:

دوو پاشای خواپەرست و دادپەروەر: سولەیمانی کوڕی داود، کە خۆی و باوکیشــی پێغەمبەر بوون، لەگەڵ (ذوالقرنین) کە پاشــایەکی خواناســی دادپەروەری ڕزگارکەر بووە. دوو پاشــا خوانەناسەکەش، زاڵم و ستەمکارو داگیرکارو خراپەکارەکەش: نەمرودو بەختونەصر بوون.

بەڵــێ نەمرود ماوەی (٤٠٠) ســاڵ حوکمی کرد. بەڵام خوای گەورە بەچــی لەناوی برد؟! بە مێشــولەیەك!! بەڵێ بەتەنها مێشولەیەك! کە خوای گەورە یەکێ لەسەربازە هەرە بچکۆلەکانی خۆی بۆ نارد کە مێشــولەیەك بوو، چووە مەڵاشویەوەو گازی لێگرت. ئەو نەمرودەی کە دەیگوت: (أَنَا۠ أُحۡيِۦ وَأُمِيتُ) کە خۆی بە خوا دەزانی، خۆی بۆ ئازاری گەستنی مێشولەیەك نەگرت. لەتاو ئازار هاواری دەکرد، بەنەعل و زنجیری ئاســن بەسەری خۆی دەکێشــا، ئەمجا کێ زیاتر دڵسۆزی نەمرود بوایە دەهات بەهەردوو دەســتی چەپۆکێکــی دەدا بەســەری نەمروددا بۆ ئەوەی تۆزێ ئازاری بشکێ!!.

بەڵێ ئەم ئەنانیە، خۆپەســەندە، خــۆ بەخوازانە، بەنەغل

لەســـەری دەدرا!! بەڵێنی پـــەروەردگارە کە فەرمویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ فِى ٱلْأَذَلِّينَ ﴾ المجادلة: ٢٠

واتە: بەڕاســـتی ئەوانـــەی دژایەتی خـــواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، ئا ئەوانە لەنزمترینی خەڵکین لە دنیاو قیامەتدا...

بەڵـــێ ئیمانـــداران: خوای گەورە ئەو ســـتەمکارەی بە یەك مێشـــولە لەناوبرد، جا مێشـــولە بەکەم مەزانن. خوای گەورە لە سوڕەتی — البقرە — دا ئایەتی (٢٦) دا، هەر لەو سوڕەتەدا کە باســـی نەمرودی تێدا کرد باســـی مێشولەشـــی تێدا دەکات و دەفەرمـــوێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْىِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ۘ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِى بِهِۦ كَثِيرًا ۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ ﴾ البقرة: ٢٦.

واتە: بەڕاســـتی خوا باکی نیـــە و نەنگ نیە بەلایەوە هەر نمونەیەك بهێنێتەوە بە مێشولەیەك، لەویش بچوکتربێت یان گەورەتـــر، جا ئەوانەی ئیمان و باوەڕیـــان هێناوە، ئەوە چاك دەزانـــن ئەم نمونەیە ڕاســـتەو لەلایـــەن پەروەردگاریانەوەیە، ئەوانەش کافرن و بێ باوەڕن دەڵێن: خوا مەبەســـتی چی بوو لەم نمونەیەدا؟ خوای گەورەش دەفەرموێت: زۆرێکی پێ گومرا

دەکات و زۆرێکی تریشی پێ هیدایەت و ڕێنمویی دەکات، بەڵام دیـــارە جگە لەلارو وێرو یاخی و تاوانباران کەســـی تر گومڕا ناکات.

بەڵـــێ ئیمانـــداران: ئەو کاتەی کـــە ئەم ئایەتـــە قورئانیە هاتەخوارەوە. کافرەکان گاڵتەیان بەباس کردنی مێشولە دەهات. دەیانگـــوت: مێشـــولە خۆی چیە تا خوا باســـی بـــکات؟! بەڵام ئەمـــڕۆ کە زانســـت پێش کەوتووە ئەمجـــا دەزانرێ کە خوای گەورە بە بێ حیکمەت لە ناو هەموو ئەو زیندەوەرانەدا باسی مێشـــولەو تەپۆی نەکردووە. فەرموون ئێوەو چەند زانیاریەك لەسەر مێشولە:

١. مێشـــولە ئامێـــری ڕاداری هەیـــە. بە هۆی ئـــەم ڕادارەوە ئاڕاســـتەی کەســـی خەوتوو لەتاریکی شـــەودا لە نـــاو جێگادا دەبینێ و یەکسەر بەرەو لای دەڕوات و دەزانێ لەکوێدا کەسێك خەوتووە. وە هیچ کات ئەم ڕادارەی مێشولە هەڵە ناکات.

٢. مێشولە (١٠٠) چاوی هەیەو چاوەکانی بەسەریەوەن.

٣. مێشـــولە کەدەگاتە ســـەر ئەو مرۆڤە خەوتووە، شـــوێنی خوێـــن مژینەکە دیاری دەکات، پاشـــان بـــەو (٤٨) ددانەی کە لەدەمیایەتـــی پێســـتەکە کون دەکات. ئەمجـــا دەرزیەکە کەلە بەرگدایە دەری دەکات و خوێنی کەسەکە دەمژێ!!.

٤. هەروەکو ئاشــکراو لەبەرچــاوە کە هەرکات مرۆڤ خوێن لەشــوێنێکی جەســتەی هــات بەزوتریــن کات خوێنەکە لەو جێگا برینداریــەدا -بەتایبەت ئەگەر برینێکی بچکۆلە بێت- دەمەیەت، ئەمەش بەهۆکاری ئەو ئەنزیمانەی کەلەناو لاشەی مرۆڤدا هەن، دەی کەواتە: بونی ئەو ئەنزیمانە کە دەبنە هۆی مەینی خوێن لە شوێنی برینداردا کاری مێشولە پەك دەخات. چونکــە ئەو کونە بچکۆلەی کە مێشــولە لە پێســتی مرۆڤی دەکات، هەر لەیەك چرکەدا خوێنی لێهاتوی دەمەیەت، کەواتە مێشــولە فریا نەکەوت هیچ خوێنێ بمژێ. بەڵام بەدڵنیاییەوە ئەم کێشەیە توشی مێشولە نابێت!! بۆچی؟.

چونکــە مێشــولە لەناو ئەو لاشــە لاوازە بچکۆلــەی خۆیدا ماددەیەك دروســت دەکات و کاتێ پێســتی مرۆڤێك کون دەکات خێرا ئەو ماددەیەی تێ دەکات، کە ئیشی ئەو ماددەیەی مێشولە دەری دەدات ئەوەیە ناهێڵێ خوێن بمەیەت!! بەڵێ ئەمجا مێشولە بە ئارەزوی خۆی خوێن دەمژێ. چونکە خوێنەکە نامەیەتەوە.

هەموشمان ئەوەمان بینیوە کە کاتێ مێشولەیەك جێگایەکی مرۆڤ دەگەزێ ئەو شوێنە -زۆربەی کات- دەئاوسێ و دەخورێ، ئەمــەش بەهۆی ئــەو ماددەیەوەیە کە مێشــولە دەیکاتە ئەو جێگایەوە بۆ ئەوەی خوێن نەمەیەت!!.

٥. ئایا بڕوا دەکەی کە لەناو جەســتەی مێشولەدا تاقیگەی پشــکنینی خوێن هەیــە، بۆیە کاتێك دوو کــەس لە ژورێکدا خەوتــوون مێشــولەکە خوێنی هەردوکیان دەمــژێ، بەڵام کە لەتاقیگــەی ناو لەشــیدا شــی دەکاتەوە، زۆر تــام و چێژ لە خوێنی یەکیان وەردەگرێ و چەندین جار دەچێتەوە ســەری، بــەڵام حــەز بەخوێنی ئەویتریــان نــاکات و وازی لێدێنێت، دەبینی بەیانی یەکێ لەو دوو کەسە دەڵێت مێشولە نەیهێشت بخەوم، کەچی ئەویتریان دەڵێت دەی من یەك دوو جار نەبێت هەستم بەمێشــولە نەکردوە، ئەمەش هۆکاری ئەوەیە کە ئەو مێشولەیە حەزی بەخوێنی ئەویان نەکردووە.

٦. ئایا بڕوا دەکەی کە مێشولە ئامێری بەنج کردنی هەیە. چونکە ئەگەر ئەو ئامێری بەنج کردنەی نەبوایە، هەرکەبەســەر جەستەی مرۆڤەوە نیشتەوە یەکسەر لێیدەداو دەیکوشت، بەڵام مێشولە بەهۆی ئەو جیهازی بەنــج کردنەوە پێش ئەوەی خەرتومەکەی بخاتە ناو پێســتی مرۆڤەکەوە دەســت بکات بە خوێن مژین، ماددەی سڕکەر – بەنج – بەســەر ئەو شــوێنەدا دەکات و سڕی دەکات و پاشان بە ئارەزوی خۆی پێستەکە کون دەکات و دەست دەکات بە خوێن مژین، ئەو ڕۆیشــتووە ئەمجا بەنجەکە خاو دەبێتەوەو مرۆڤەکە هەســت دەکات کە مێشولە خوێنی مژیوەو شوێنەکەی دەخورێنێت!!..

٧. زۆربـــەی خەڵکی وادەزانن کە مێشـــولە بە خوێن دەژی، بـــەڵام ئەم بۆچونـــە هەڵەیە، چونکە تەنها مێ یەی مێشـــولە خوێن دەمژێ، ئەویش بۆ ئەوەی هێلکەکانی ناو سکی پڕ بکات لە پرۆتین تا گەورە ببن و پێ بگەن، کە لە خوێنی مرۆڤەوە وەری دەگرێ.

بۆیـــە قورئـــان دەفەرموێت (بعوضة) مێشـــولەی مێ!! (ئایا ئەگەر قورئان کەلامی خوا نەبێت، پێغەمبەر (ﷺ) چۆن زانی مێشـــولەی مێ مرۆڤ دەگـــەزێ و خوێنی لێ دەمـــژێ!) بەڵێ بەگشتی خۆراکی مێشولە بریتیە لە شیلەی گوڵان.

٨. مێشولە ویزەویزی دێ، ئەوە دەنگی باڵەکانیەتی، کە لە یەك چرکەدا (٦٠٠) جار باڵی ڕادەوەشێنێ و ئەو دەنگەی لێ دێ..

٩. مێشولە (مێ) دڵی هەیە!!! دڵێکی ناوەندی، وەهەر باڵەش دڵی خۆی تێدایە!! سبحان الله باڵی مێشولە، لەتەنکیدا نمونەی پێدەهێنرێتەوە وە کـــە دەوترێت: ئەوەندە تەنکە دەڵێی باڵی مێشولەیە. کەچی لەناو ئەو باڵەدا دڵ هەیە!!!

١٠. لـــە ناو قاچی مێشـــولەدا، نینـــۆك و چڕنوك هەیە. کە توانای خۆڕاگرتنی بەســـەر هەموو شـــتێکەوە هەیـــە. ئەوەتا مێشـــولە خۆی بەسەر شوشەوە دەگرێ!! جا مێشولە لە هەموو کاتێ ئەم نینۆك و چڕنوکەکانی بەکار ناهێنێ، بەڵکو سەیری

ئەو شوێنە دەکات کە دەیەوێ لێی بنیشێتەوە، جا ئەگەر ئەو شـــوێنە شـــوێنێکی زبر بوو، یان ســـەر خوری و شتی وا بوو، ئەوا ئەو نینۆکانەی دەرناکات بۆ ئەوەی لەشت نەگیرێ. بەڵام ئەگەر لەسەر شوشەو شتی لوس نیشتەوە، ئەوا دەریان دەکات و بەکاریان دەهێنێ!!

لە ســـودەکانی مێشولە: زۆربەی گوڵەکان بەهۆی مێشولەوە دەپیتێن، چونکە لەســـەر ئەمیان دەنیشـــێتەوەو تۆوی ئەویان دەباتە سەر ئەویان!..

لە زیانەکانی مێشولەش: نەخۆشی ترسناك دەگوازێتەوە، وەکو مەلاریا کە بەهۆی مێشـــولەی (ئەنفلوس) ەوە دەگوێزرێتەوە، کە زانـــای بەناوبانگ (ڕونالد ڕووس) لە ســـاڵی (١٩٠٢ز) دۆزیەوە.. وە هەروەهـــا (داء الفیـــل) یش دەگوازێتەوە. ئەمـــەش - والله اعلم- هـــەر بـــۆ خزمەتی مرۆڤـــە، تاوەکـــو بەهۆی تـــوش بونیان بەو نەخۆشـــیانە بزانـــن ئەم دەردە هەیەو خێرا ئـــەو ناوچەیە پاك بکەنەوە لە زۆنگاوو پیسی و نەخۆشیەکە، چونکە ئەگەر لەترسی خۆپاراســـتن لەو نەخۆشـــیانە نەبوایە، ئەوا ژینگە بۆنی دەکرد. وە ئەو نەخۆشیانەی کە مێشولە بڵاویان دەکاتەوە زۆر سامناکن. بۆن مونە (الحمی الصفراء) لە ساڵی (١٩٦٠ز-١٩٦٢ز) تەنها لە ماوەی دوو ساڵدا لە (أثیوبیا) (٣٠) سی هەزار کەسی کوشت!!.

وە مێشــولەش یەکێ لە ســەربازەکانی خوای پەروەردگارەو خــوای گەورە کردویەتی بەمایەی لەناو بردنی ملهوڕێکی وەك نەمرود..

## سەرچاوەکان:

١. قورئانی پیرۆز – تەفسیری ئاسان.

٢. گۆڤاری بڕیار، ژ: ٤٧، ل٣٤.

٣. قصص الانبیاء، محمد متولي الشعراوي. ص٨٧.

٤. تەفسیری ڕەوان، ملا محمودی گەلاڵەیی. بەرگی ٢، جزمی ٣، ل ٢٧.

٥. ژیاننامەی پێغەمبەران، ابن کثیر، وەرگێڕانی: کاروان محمد.ل ١١١.

٦. موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة، یوسف الحاج احمد. ص ٥١٠.

٧. موسوعة الإعجاز القرآني، د. نادیة طیارة. ص٢٧٧.

٨. آیات الله فی الآفاق، د. محمد راتب النابلسي. ص٤٠٩.

٩. الإعجاز العلمي في القرآن والسنة. م. نایف منیر فارس. ص٢٥٩.

١٠. الموسوعة الذهبیة في إعجاز القرآن الکریم، د. أحمد متولي. ص ٣٧٥.

# بەشی سێیەم

الحَمْدُ لِلهِ رَبِّ العالَمين والصَّلاة والسَّلام عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدْ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعين.

ئیمانداران: لە دوو ووتاری ڕابردودا باسی ئەوەمان کرد کە ئەنانیەت و خودپەرستی چەند خراپە، چۆن مایەی بەهیلاك چونی ئەو کەسە ئەنانیەیە، بەڵام ڕەنگە یەکێ بپرسێ: باشە ئەی مرۆڤی ئیماندار لەو هەموو ڕۆژگارەی تەمەنیدا، لەو هەموو کارە خێرانەی کە ئەنجامی دەدات و لەسەریشی پێویستە وەکو خۆی چاکە کارە، بێتە ڕێ نیشاندەرو پێشەنگی خەڵکیش بۆ ئەنجامدانی کاری چاکە، دەی بەم هۆیەوە پێویستە هەندێ جارو لە هەندێ حاڵەتدا، مرۆڤی ئیماندار باسی خۆشی بکات و (أنا) من بەکار بهێنێت، ئایا ئەمەش دروست نی یە؟.

لە وەڵامدا دەڵێین: مرۆڤی مسوڵمان کە وشەی (أنا) من ی بەکارهێنا، هیچ کات مەبەستی خۆپەسەندی و ئەنانیەت و خۆبەزلزانین و خەڵك بە هیچ زانین نیە، بەڵکو مەبەستی

ڕاستی دەربڕینێکەو وەکو سوپاس کردنی خوا وایە کە هیدایەتی داوە بۆ ئەوەی ئەو کارە جوانە ئەنجام بدات.

مسوڵمان کاتێك دەڵێت: من ئەو کارەم کرد، مەبەستی ئەوەیە کە لەفەزڵی خوا بەزیاد بێ، من لە فلاّن لایەنی چاکەدا بووم، لـــە کاروانی چاکەکاراندا سەرەگوریســـێکم گرتـــووە، ئازارێکم لـــەڕێ ی کاروانی صاڵحاندا لابـــردووە، لە مەڵۆو خەرمانی پڕ بەرەکەتی خواناساندا شتێکم زیادکردووە.

بـــۆ نموونە: نـــوح پێغەمبـــەر (عليه السلام) لە بـــواری بانگەوازو گەیاندنـــی پەیامی خوادا دەفەرموێت: ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا ﴾ نوح: ٥.

لـــە لێزانـــی و شـــارەزایی لـــە بەڕێوەبردنی ولاّتدا یوســـف پێغەمبەر (عليه السلام) فەرموی: ﴿ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ ﴾ یوسف: ٥٥.

بەڵێ: کاربەدەســـتی مسوڵمان، لێپرسراوی قوت و داهاتی ووڵات و میللەت، بۆی هەیە وەکو دەربڕینی سوپاســـگوزاری بۆ خـــوای گەورەو باســـکردنی بۆ خەڵکی، کە من لەســـایەی بڕوا بون بە چاودێری خواوە خاوەنی ئەو دوو ڕەوشـــتە پەسەندو بـــەرزو بالاّیـــەم. (حَفِيظٌ) پارێـــزەری دارایی گشـــتی ووڵات و بەفیـــڕۆ نەدانـــی و تەش و بوش نەکردنی و بەرهەم هێنان و زیادکردنی.

هەروەهــا (عَلِيمٌ) شــارەزایی و پســپۆڕی و لێزانی، چونکە کەسی وا هەیە دڵسۆزو خەمخۆرە، بەڵام لێزان و خەمخۆر نی یە، بۆیە ناتوانێت خزمەت بکات.

بەڵێ ئەگەر کاربەدەســت و لێپرسراوێ (حَفِيظٌ عَلِيمٌ) بوو، دروســتەو جێــگای خۆیەتــی بڵێ من وام، نــەك وەکو ئەمڕۆ شانازی بکات کە چۆن شادزێکەو ئەو ڤێلاو باخ و ڕیزە دوکان و ڕیزە ئۆتۆمبێلی جام ڕەشەی بە پارەی میللەت کڕیوە..

بەڵــی تــۆی ئیماندار کاتێ لە فەرمانێکــی خوا لاتدا، وەکو یونــس پێغەمبەر (عليه السلام) بڵێ: ﴿إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ نەك بە شانازیەوە بڵێ ی من ئەو گوناهەم کردووە!..

هەروەها کاتێ نەخۆش کەوتی وەکو ئەیوب پێغەمبەر بڵێ: ﴿أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ .

ئەگــەر خەڵکی هەمــوو ڕویان لــە غەیری خــوا کرد، تۆ وەکــو ئیبراهیم بڵــێ: ﴿إِنَّنِي بَرَآءٞ مِّمَّا تَعۡبُدُونَ﴾ ﴿لَآ أُحِبُّ ٱلۡأٓفِلِينَ﴾ وەکو شــوعەیب بڵێ: ﴿إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُ﴾.

هەروەها خوای پەروەردگار لە قورئاندا باسی خۆشەویستمان، پێغەمبەرمــان محمــد (ﷺ) دەکات و دەفەرموێ: پێغەمبەری خۆشەویســتم بڵــێ: ﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ﴾ بەڵام ئەوەندە

هەیە ﴿ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ ﴾ ..

بەڵێ لە هەموو ئەم شــوێنانەدا پێغەمبەرانی خوا ووشەی (إنــی، أنا) یان بەکارهێناوە. بەڵام هیچ جۆرە خۆپەســندیەکی تێدا نی یەو بە پێچەوانەوە ملکەچی نواندنە بەرامبەر خوای گەورەو سوپاسگوزاریەتی.

بەڵــێ ئیمانــداران: پێغەمبــەری خوا (ﷺ) وشــەی (أنا) ی بەکارهێناوە. بەڵام چۆن؟.

جارێکیان کەســێك لەبەردەمی خۆشەویستدا قسەی دەکرد، لــە هەیبەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەلەرزی و دەســتی خۆی دەگلۆفی و دەمی ووشك ببوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هَوِّنْ عَلَيْكَ، فَإِنِّي لَسْتُ بِمَلِك، إِنَّمَا أَنَا ابْنُ امْرَأَة تَأْكُلُ الْقَدِيدَ) رواه ابن ماجه (٣٣١٢).

لەسەرخۆو ئارام بە، مەشڵەژێ، بۆچی دەترسی، بە ڕاستی من تەنها کوڕی ئافرەتێکم کە لەبەر هەژاری گۆشتی وشککراوەمان دەخواردو دایکم توانای کڕینی گۆشتی تازەی نەبوو!..

بە شانازیەوە دەیفەرموو: من شوانیم لەم شیوو دۆڵانەدا بۆ خەڵکی کردووە بەکرێ و پارەیەکی کەمم وەرگرتوە!.

دەی بــا (مــن) و باســکردنەکانی ئێمەش ئاوا بێ و باســی ڕاستیەکانی ژیانمان بکەین و بڵێین: من ئاوا بووم و ئەمڕۆ کە

ئاوام ئەوە فەزڵ و بەخششی خوایە بەسەرمەوە، نەك خەبات و هەوڵی خۆم!..

ئیمانداری بەڕێز: تۆش با (أنا) من منەکەت بۆ باسکردنی کاری چاکەبێ، بۆ ئەوەبێ بڵێ ی منیش هەم کە بەرگری لەم ئیسلامە بکەم و بۆ سەربەرزی و سەربەستی خۆم نەهێڵم ناحەزانی ئیسلام زەرەر لە ئیسلام و مسوڵمانان بدەن، هەروەکو ئەبوبەکری صدیق کە فەرموی: (أَيَنقُصُ الدِّينُ وأنا حيٌّ) تۆش بڵێ: من بۆ ئیسلام دەژیم. من لەسەر ڕێبازی ئیسلام دەژیم. مردنم باشترە ئەگەر ئیسلام شکست بێ.

ئای چەند خۆشە مسوڵمان وەکو دەربڕینی لوتف و بەزەیی خوا بەسەریەوە بڵێ: سوپاس بۆ خوا ئەوەندە ساڵەیە نوێژێکی جەماعەتم نەفەوتاوە. هەروەکو سەعیدی کوڕی موسەیب دەیفەرموو: سوپاس بۆ خوا پەنجا ساڵە یەك نوێژی جەماعەتم نەفەوتاوە.

بەڕێزان: بابەتێکی گرنگی تر کە لەم باسەدا پێویستە ئاماژەی پێ بکەین ئەوەیە کە: پێویستە لەسەر دەوڵەت و دەسەڵات، کە ئازادی بدات بە هاوڵاتیانی کە بە ئازادی بڵێن: (من) ئەوەم و ئەوەم داوایە. بە ئازادانە ڕەئی و بۆچونی ناو ناخی خۆی دەرببڕێ.

لــەرۆژگاری ئەمــڕۆدا لەڕێگــەی ڕۆژنامــەو ڕاگەیاندنەوە، هاوڵاتــی ئازادانە بونی خۆی بســەلمێنێ، بە ئازادی بنوســێ، ڕەخنــەی بەجــێ بگرێ، پێشــنیار بکات و بڵــێ منیش ئەمە بۆچونمە.

هەر ووشەی (صحافة) لە (صفحة — ڕوو بەڕوو)ەوە هاتووە. هەروەکــو (مصافحة) تەوقەکردن بەمانای دەســت بخەرە ناو دەستم و مەترسە دەستم ئەمینە، دڵنیابە خێرم پێ یەو زیانم بۆت نی یە. بۆ ئەوەی نیفاقی سیاسی دروست نەبێ.

بەڵێ هەر دەسەڵاتێك ڕێگا بەخەڵك نەدات قسەی خۆی بکات، چارەنوســی لەناوچونە، چونکە وەکو غازێکی پەنگ خواردوی لێ دێ و ئەگەر هەناسەی دەرنەچوو لە پڕا دەتەقێ.

بەڵێ ئیمانداران: ئاینی ئیسلام مرۆڤی مسوڵمانی وا ڕاهێناوە کە هەمیشــە لە ئەنانیەت و خودپەسەندی و تەنها خۆ بینین بەدوربــێ. ئەوەتا لەناو نوێژدا، کاتــێ تەنهای و بەتەنها نوێژ دەکەی، ناڵێی: (إيّاكَ أعبُدُ وإيّاكَ أستَعين)، بەڵکو خۆت دەخەیتە ناو ڕیزی ئیماندارانەوەو دەڵێ ی (إيّاكَ نعبُدُ وإيّاكَ نســتَعين) بۆ ئەوەی بەتەنها خۆت نەبینی و توشی ئەنانیەت ببی!.

هەروەها کاتێ مســوڵمانێ دێتە مزگەوتەوەو ڕیزی یەکەمی نوێــژی جەماعەت پڕبووەو کەلێنێك نەمــاوە، لەو کاتەدا ئەو

مسـولمانە بۆی نییە بەتەنها نوێژ بکات، بەڵکو دەبێ دەسـت لەشـانی کەسـێك لـە لەریـزی یەکەمدایە بـدات و ئەویش بەهەنگاوێـك بەرەو دواوە بگەڕێتەوەو بەیەکەوە ریزێکی نوێ بۆ نوێژی جەماعەتەکە دروسـت بکـەن!. ئەمەش لە پێناوی ئەوەی نەوەکو کەسێك ئەنانیەتی لە دڵدا دروست ببێ و حەز بـکات لە نوێـژی جەماعەتی ناو مزگەوتیشـدا بەتەنها بێ و هاوشانی خەڵکی نەبێ!!..

بەڵێ ئیمانداران: مرۆڤی مسـوڵمان پێویستە لەسەری خۆی بپارێزێ بەهەر کارێك کەوا بەرەو ئەنانیەت و خودپەسەندی ببات. وە چارەسەریش ئەوەیە کە:

هەمیشە یادی خوا بکەین و دڵنیا بین لەوەی کە بۆ ماوەی کەمتر لەچاوتروکانێ لوتف و ڕەحمی پەروەردگارمان لەگەڵدا نەبێ تیادەچین.

جا لەبەر ئەوە با هەمیشــە بەم دوعایەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە خـوای گەورە بپاڕێینـەوەو بڵێین (اللّهـمّ لَا تَكِلْني إلَى نَفْسِي طَرْفَةَ عَيْنٍ ولاَ أقَلَّ من ذلكَ) خوای پەروەردگار مەمسپێرە بە نەفسـی خـۆم بۆ مـاوەی چاوتروکانێـك و کەمتریش لە چاوتروکانێـك، چونکە من بەکەڵکی خـۆم نایەم، وە ناتوانم پارێزگاری لە بچوکترین پێداویسـتی لاشەم بکەم کە تۆ پێت

بەخشیوم، لەبەر ئەوە چۆنت پێ بەخشیوم، ئاواش هەر خۆت پارێزگاریم لێ بکە.

نمونەیەك: لە فرمێسـکی مرۆڤدا جـۆرە ماددەیەك هەیە کە دەتوانێت زیاتر لە (سەد) جۆر بەکتریاو ڤایرۆس بکوژێت، سـەیر لەوەدایە ئەگەر ئەو فرمێسکە (شەش سەد) جار ڕوون بکرێتەوە، هەر هەمان تواناو کاریگەری خۆی دەمێنێت!!.

دەی ئەگەر چاو لەو هەزاران شتەی کە تێیدایەو بەبێ بوونی هەرکامیـان، گرفتێکی گەورە لەچاودا دروسـت دەبێت، ئەگەر هیچیان کەموکوڕیان بەسـەردا نەیەت هەر تەنها فرمێسـکی چاوەکە، ئـەو ئاوە پاکژکەرەوەی تێـدا نەمێنێ، مرۆڤ کوێر دەبێت..

جـا ئەگەر مرۆڤ زانا بێ بەلاشـەی خـۆی و بەتەعبیری قورئانی ﴿ وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ﴾ جێ بەجێ بکات، ئەوە بەڕاستی لە ئەنانیەت ڕزگاری دەبێت.

هەربۆیە دەبینین بە شـێوەیەکی گشـتی ئەو کەسانەی کە ئەنانـی و موتەکەبیرو خۆپەسـەندن. کەسـانێکی نەزان و نا ئاشـنان بە زانست و زانیاری، یان ووشکە زانیاریەکیان هەیەو یەك دوو ڕستە فێربون و دینداری و خواناسیشی لەگەڵ نیە، ئەوجا لە جیاتی ئەوەی چاکتر خۆیان بناسـن و لە ئەنانیەت

دووربــن. بە پێچەوانەوە زیاتر توشـــی کەیــف بەخۆ هاتن - عجــب — و ئەنانیەت دەبـــن و وادەبینن کە خەڵکی هەمووی نەزانەو ئەوەی ئەم دنیایەی بەڕێوە بردووە ئەوە!!.

ئیماندارانی بەڕێز: هەر کەســێك بەدەسەلاتی خۆی نازی و ووتــی: (أنا) من وادەکەم و وامکرد، ئەوە خوای گەورە هەر لە دنیادا پێش قیامەت سوك و ریسوای دەکات. وەکو نەمرود.

نمونەیەکی واقعی و بەرچاوی ئەم سەردەمە: (ئاریل شارۆن) ی ســەرۆك وەزیرانی پێشوی ئیسرائیل کە تاوانی کۆمەڵکوژی زۆری دەرهەق بە گەلی فەلەستینی کرد لە ماوەی دەسەلاتیدا، لە هەمویشـــی خراپتر کۆمەڵکوژی (ســەبراو شــاتێلا) یە کە چەندیــن هاولاتی فەلەســتینی بونە قوربانی. شــارۆن دوای ئەوەی بە هۆی جەڵتەوە بۆ ماوەی چەندین ســاڵ بێهۆش بوو مێشکی مردبوو بەلام دڵ و ئەندامەکانی تری جەستەی کاریان دەکرد، بۆیە تا مرد بە بێهۆشـــی چەند ســاڵێ لە نەخۆشخانە چاودێری دەکرا!!.

ســەرچاوەیەك لە نەخۆشــخانەی (شــەبعا)ی تەلئەبیب کە شارۆنی تێدابوو ڕایگەیاند:

کــە بەڕێوبەرانی نەخۆشــخانەکە داوایــان لەکەس و کاری کــردووە کە بیبەنەوە بۆ ماڵەوەو دکتــۆری تایبەتی لەماڵەوە

بۆ دابیــن بکەن. چونکە نەخۆشــخانەکە ڕایگەیاندووە چیتر ناتوانێت چاودێری بکات. بەڵام بنەماڵەو کەس و کاری شارۆن ئەم داوایەیــان ڕەت کردەوەو داوایان لە نەخۆشــخانەکە کرد کە چاودێری شــارۆن بکات و هەڕەشــەی ئەوەشــیان کرد کە ســکاڵا تۆمار دەکــەن ئەگەر بێتوو نەخۆشــخانەکە خۆی لەم کارە بدزێتەوە. چونکە پێیان وایە دەبێت حکومەت چاودێری شارۆن بکات.

بەڕێزان: مسوڵمان کاتێ ووشەی (أنا) بەکاردێنێ، بۆ ئەنانیەت نیــە بەڵکو لە جێ ی خۆیدا بەکاری دێنێ و حەق و ڕاســتی پێ ئاشــکرا دەکات و دەمکوتی هەڵپەرســتێکی پێ دەکات، بۆ پاراستنی کەسایەتی و عیزەتی نەفسی خۆی بەکاری دێنێ..

نمومەیەك لە کوردستانەوە: مەلا حەسەنی دزڵی کە لەساڵی (١٢٧٥) ی کۆچــی لەدایك بووە، لە کوردســتانی ڕۆژهەڵات، لە گوندی (وەیســیا) لە بنەماڵەی مەردۆخیەکان. ئەم مامۆستایە مــاوەی (یانزە) ســاڵ لە وڵاتی (میصر) دەخوێنێ، شــاعیرێکی گــەورەو توانــادار بــووە. نازناوی شــعری (هیجری)یــە.. ئەم شــاعیرە ئەوەنــدە زانا بووە کە مامۆســتا مــلا عبدالکریمی مدرس دەفەرموێ: مەلا حەسەنی دزڵی لە هەموو عیلمەکاندا دەستێکی باڵای هەبووە..

مامۆستا قانعی شاعیریش وتویەتی: ئەگەر وەك ملا حەسەن شاعیر بومایە، دەنگی داماوی کوردم دەگەیاندە هەموو دونیا.

ئەم شــاعیرە گەورە زۆر هەژارو دەست کورت بوە، تەنانەت لەبــەر هــەژاری کتێبەکانی فرۆشــتون و نەمــاون!! چەندین پینــە بــە جل و بەرگیەوە بــووە. یەکێك لە دەســەڵاتدارانی ئــەو ســەردەمە داوای لیکــردووەو بەڵێنــی پــێ داوە بیکاتە نوســەری تایبەتی و مودەریس و قازی مەحکەمە {ئەم پیاوە زۆر دەوڵەمەندو پلەدار بووە، لەو ســەردەمەدا نێوانی لەگەڵ ئینگلیز زۆر خۆشــبووە}. بەڵام مامۆستا مەلا حەسەنی دزلی بەنامەیەك بە شیعر وەڵامی دەداتەوەو دەڵێ:

قودرەت و سەروەت جاهو جەلادەت
پێشکەش بەوانەی پیان شیرینە
سەد تف و لەعنەت لە قوربان قوربان
لە ئاغا فەرمووی یەکجارم قینە
خۆم زەلیل ناکەم بۆ فلس و دینار
ئەویش لە سایەی عیززەتی دینە
پێم خۆشە نانی جوێ رەشی عەباڵ
دوێنەی خەجیجەو فاتەو جەمینە
کاڵە و کڵاشی ساختی هەورامان

نایدەم بە قۆنرەی چەرمی مـەکینە
ئیسلام عیزەت و عیلم و کەرامەت
کوردو شەرافـەت ڕەسمی دێرینـە
هەی هوو چەن دوورین من و نۆکەری!
ئەمەش هەر جـۆرێ کاسەلێـسینـە
سەلام سەییدی (وێرمەنە) دینار
خوویـەکی پیـسو زۆر نـاشیرینـە
ناکەومە پینەی درۆی ئاغایان
کەوش و کەراسی خۆم ئەکەم پـینـە
ئاخر من قوربان وا لەسەر سینەم
(الـطَّيِّبـاتُ للطَّيِّبـيـنَ) ە
من هەڵۆی لووتکەی بەرزی دالانیم
هەرگیز وەك قالاو ناکەومـە چـینە
حەسەن بۆ مەقام نۆکەری نـاکا
سەدجـار ریامە ئـەو جۆرە ژیـنـە

ئای خۆزگە هەموو زانایانی ئاینی، پێشەوایانی ناو مینبەرو میحراب، ئاوا خاوەن عیزەتی بەرز بونایەو ڕەفزی هەموو ئەو پێشـنیارو شـتە ماددیە کەم نرخانەیان بکردایە کە لەلایەن دەوڵەمەندان و دەسەڵاتدارانەوە دەخرایە بەردەستیان، بۆ ئەوەی

خشـــتێك لەقەڵای ئیمان و عیزەت و شەهامەتی مسوڵمانانەی زانای مســـوڵمانیان بێننە دەرەوەو پاشـــان بـــە ئارەزوی ئەوان قسە بكەن و وتار بدەن و فتوا دەركەن!!.

بەرێزان: یەكێ لە گرفتە هەرە گەورەكانی ولاتانی ڕۆژهەلات بەگشـــتی و بەتایبەتی ئەو وولاتانەی كە سالانێكی زۆر لەژێر ستەم و چەوسانەوەدا ژیاون و نیشتمانیان بۆیان بۆتە دۆزەخ و بەندیخانە، سەرەنجام خۆشەویستی بۆ خاك و وولات نەماوەو كز بـــووە. دەبینین مرۆڤەكانی هەریەكـــە تەنها بەرژەوەندی خۆی دەبینێ و تەنها ئیشـــی خۆی ڕاییـــی ببێ، ئیتر خەڵكی زەرەر دەكەن، وولات كاول دەبێ، خۆی سەرەنجام زەرەر دەكات، بەلایەوە گرنگ نی یە.

بە پێچەوانەی ئەو وولاتانەی كە هاولاتیانی هەر لە منالێیەوە خۆشەویستی نیشـــتمانەكەیان بۆتە بەشێكی لەبیر نەكراو لە ژیانیاندا. با سەرنجی ئەم بابەتە بدەین:

كەسێك كە چەند مانگێكی زۆر لە وولاتانی غەریبیدا ژیاوە، دوا وولاتیش كە تێیدا نیشتەجێ بووە وولاتی (نیوزلەندا) بوو، لـــەو وولاتەدا بژێـــوی ژیانی خۆی و ئەندامانـــی خێزانەكەی بە دوكانی میوە فرۆشـــی پەیدا دەكرد، لە كاتی بەڕێوەبردنی دوكانەكەیـــدا هیـــچ كات لـــە چۆنیەتی هەڵســـوكەوتی كڕیارە

بیانیەکان – واتە هاوڵاتیانی ئەو وواڵاتە (نیوزلەندا) -سەرسامی خـــۆی دەرنەبڕی، بەڵام کڕیارە کوردەکان وایان لێکرد هەردەم ڕابمێنێت لە داواکاری و پێداویســـتیەکان- دانیشتوانی ئەصلی وواڵاتەکـــە- ئەویـــش کاتێ دەهاتـــن بۆ دوکانەکەی، کیســـە یا سەبەتەیەکیان دەهێنا لەگەڵ خۆیاندا، بە پێچەوانەی خەڵکی خۆمـــان کە بەدەســـتی بەتاڵی دەهاتن و بۆ هـــەر کیلۆیەك و هـــەر جۆرێـــك، زەرفێکیان داوادەکرد، بۆیـــە دوکاندارەکە ئەم جارە پرســـیاری لە کڕیـــارە بیانیەکان کردو ووتی: بۆچی ئەم کیســـەو سەبەتانە لەگەڵ خۆتان دەهێنن؟! خۆ زەرفمان لایەو بێ بەرامبەرە، چەندی بتانەوێت دەتوانن بەکاری بهێنن.

ئەو ژنـــەی کە پەتاتەکەی لە ســـەبەتەکەی دەکردو لێوەی نزیك بوو، بەدەنگێکی نزم وەڵامی دایەوەو ووتی: ئەگەر ئێمە بۆ هەمـــوو جۆرە میوەیەك و هەر پێویســـتیەك زەرف بەکار بهێنین، شارەکەمان دەبێت بە ژێر زەرف و پاشماوەوە، چونکە کە گەیشتینەوە ماڵ، کارمان پێی نەما، فڕێی دەدەین، ئەمەش دەبێتە هۆی پیس بوونی ژینگەی شـــارەکەمان، هەر کاتێکیش ژینگەی شـــار تێکچوو، بزانە ژیان و تەندروستیمان دەکەوێتە مەترسی یەوەو هەر ڕۆژەی نەخۆشیەك لەناومان بلاودەبێتەوە، ئەمەی ووت و پارەی کەلوپەلەکانی پێداو ڕۆیشت..

بەڵێ ئەو کات تێگەیشــت بۆچی لەجیاتی زەرف هەریەکەو سـەبەتەیەکی پێ یە.. ئەو وایدەزانی ئــەوان لەبەر پارە ئەو سـەبەتانەیان هەڵگرتووە. واتە پارە بە زەرفەکە نادەن. بەڵام نەك هــەر وانەبوو، بەڵکو دەرکەوت کە لەبەر خۆشەویسـتی نیشتمانەکەیان و پاك ڕاگرتنی ژینگەی شارەکەیان بوو!

بەپێچەوانــەی خۆمــان، نەك لە وولاتــی بێگانە، بەڵکو لە نیشــتمان و شــارو گەڕەکی خۆشــمان وامان بیرنەکردۆتەوە، بەتایبەتی لەڕۆژانی گەشــت و سەیراندا دەبینین چۆن زەرفە ڕەنگاو ڕەنگەکانی بەتاڵ و پڕ لە پاشــماوە، چۆن ئەو ناوەیان ناشیرین و پیس کردووە. کەس هەست بەو بەرپرسیاریە ناکات کە ئەمە ماڵ و شاری خۆیەتی، باشە ئەگەر ئێمە وەفامان بۆ نیشتمانی خۆمان نەبێت، ئەی کێ دەیبێت. بۆچی وابین؟!

دوای ئەو هەموو خۆشــی و خۆشگوزەرانی یە، بەڵام ئێوارە کــە دەگەڕێینەوە ئەوەندە پاشــماوەو پیســی بەجێ دەهێڵین، وا دەزانیــن جارێکی تر نەخۆمان، نە کەســێکی تر نایەتەوە ئــەم جێگایە.. کە ئەمــەش هەمووی بەرهەمــی ئەنانیەت و تەنها خۆبینیە و حیســاب بۆ کەسانی ترو بەرژەوەندی گشتی نەکردنە.

بە ئومێدی ئەوەی ڕۆژگارێك بێتە پێشــەوە، هەمووومان لە

منالێکـــی بچوکەوە تا کەســـێکی بەتەمەن ئـــەو ئەنانیەتەمان فـــرێ دابێ و هیچ کات هەر خۆمان و بەرژەوەندیە تایبەتی و کاتیەکانی خۆمان نەبینین. بەمەش بەختەوەرو وولات ئاوەدان دەبین.

ئیمانداران: بەڕاستی کەسانی بەویژدان و خاوەن هەڵوێستی نـــاوازەو بەرز، دورن لە ئەنانیەت و خۆپەرســـتی. چونکە ئەو جۆرە کەسانە پەروەردەی ئیمانی پێی گەیاندون، کە پێغەمبەری پێشەوامان (ﷺ) فەرمویەتی: (لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ) رواه البخاري برقم (١٣).

لەم جیهانەشـــدا بەڕاستی کەسانێکی زۆر هەن کە دورن لە هەموو ئەنانیەتێك و بەڕاستی ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە، بۆ هەموو خەڵکیشی پێ خۆشە.

ســـەرنجی ئـــەم ڕوداوە واقعیە بـــدەن: دوای ئەوەی پیاوێك کوڕە تاقانەکەی توشی ڕوداوی ئوتۆمبێل بوو، لە نەخۆشخانەی تایبەتمەنـــدەوە پەیوەنـــدی بە پزیشـــکی پســـپۆڕەوە کرا کە ئامادەبێت، دکتۆر هەر زوو بە پەلە گەیشـــتە نەخۆشخانەکە. بۆ ئەوەی نەشتەرگەری لەناکاو بکات بۆ منداڵەکە.

پێش ئەوەی بچێتە هۆڵی نەشـــتەرگەری، باوکی منداڵەکەی بینـــی، دەهات و دەچوو، زۆر نیگـــەران بوو، باوکی منداڵەکەش

کاتێ دکتۆرەکەی بینی، هاواری کرد بەسەر دکتۆرەکەداو ووتی: لەبەرچی ئەوها درەنگ هاتی، ئەی نازانی ژیانی مناڵەکەم لەمەترسیدایە؟!.

دکتۆرەکە بەهێمنی وەڵامی دایەوەو ووتی: لەسەرخۆبە برام، من لەنەخۆشخانە نەبووم، کاتێ پەیوەندیم پێوەکرا، هەر کە هەواڵی منالەکەی تۆشیان پێدام کە پێویستی بەنەشتەرگەری کتوپڕەو ئەو نەشتەرگەریەش تەنها بەمن دەکرێت و دکتۆری پسپۆڕی ترمان نی یە لەم بوارەدا، هەوڵمداوە بەزوترین کات بگەمە ئێرە، ئێستاش لەسەرخۆبەو ئارام بگرەو پشت بەخوا ببەستە.

باوکی منالەکە بەتوندی هاواری کرد: ئارام بگرم؟! ئای دکتۆرێکی چەند خەم ساردی، باشە ئەگەر کوڕێکی خۆت بوایە وات دەوت؟! دکتۆرەکە زەردەخەنەیەکی کردوو ووتی: ئیسلام ئەوەمان فیر دەکات لەکاتی ڕوداوو کارەسات و ناڕەحەتیدا، دەبێ ئارامماں هەبێت. ئەوەی خوا حەزبکات هەر ئەوە دەبێت. ژیان بەدەست خوایە، نە درێژ دەکرێت و نە کورت، ئەوەی پێویست بێت بۆ کوڕەکەت دەیکەین. بڕۆ دەست نوێژ بشۆو دوعای بۆ بکە باشترە.. باوکی منالەکە بەگاڵتە پێکردنێکەوە سەری بۆ دکتۆرەکە بادا، دکتۆر چووە ژوری نەشتەرگەری و پاش ماوەیەك هاتە دەرەوەو وتی:

مـــژدە بێـــت براکەم، ئێســـتا حاڵـــی کوڕەکەت زۆر باشـــەو نەشتەرگەریەکەی سەرکەوتوو بوو، دواتر یاریدەدەرەکەم باسی حاڵەتی مناڵەکەت زیاتر بۆ دەکات، ئێســـتا من درەنگمە دەبێ بڕۆم، کارێکی زۆر گەورەو گرنگم هەیە.

باوکی کوڕەکە کاتێ مناڵەکەی هاتە دەرەوە بەیاریدەدەرەکەی دکتۆری ووت: ئەو دکتۆرە زۆر لەخۆبایی یە، ڕانەوەستا تاوەکو هەندێ پرسیاری لێ بکەم، دەربارەی حاڵەتی کوڕەکەم.

یاریدەدەرەکـــەی دکتۆر چاوی پڕبوو لە فرمێســـك و ووتی: دوێنێ شـــەو کوڕەکەی دکتۆر لە ڕوداوێکـــی دڵتەزێندا گیانی لەدەســـتدا، ئەمـــڕۆ خەریکی ناشـــتنی کوڕەکەی بـــوو، لەبەر ئـــەوەی کە تاکە دکتۆرە لە نەخۆشـــخانەکەمان کە پســـپۆڕی نەشتەرگەری بێت لەو بوارەدا، ناچاربووین کە تەلەفونمان بۆ کرد، ئەویش بەپەلە هات بۆ ئەوەی ژیانی کوڕەکەی تۆ ڕزگار بکات. ئێســـتاش بۆیە زوو ڕۆیشـــت بۆ ئەوەی فریای ناشـــتنی کوڕەکەی بکەوێت!.

باوکی کوڕەکە دەستی کرد بەگریان و فرمێسك بەچاوانیدا هاتە خوارەوەو ووتی: ئای خوایە گیان، من چ بێڕێزیەکم کرد بەرامبەر بەو پیاوە گەورەو خۆڕاگرە.

خوایە گیان وەك ئەو دکتۆرە ئیماندارە ئێمەش فێری ئارام

گرتـــن و لێبوردەیی بکەیت. خوایە گیان دڵێکی ئارام گرتومان پێ ببەخشی لەکاتی ناخۆشیدا.

بەڕێزان: بەڕاستی ئەم جۆرە کەسانە مەردن، دورن لە هەموو ئەنانیەت وخودپەســـەندیەك. خۆزگە هەموو ئەو کەســـانەی خاوەنی پیشەو زانستێکن، خاوەنی پۆست و پلەیەکن، ئاوا دور بونایە لە ئەنانیەت و وەك ئەم پزیشـــکە خاوەن هەڵوێســـتی بـــەرز بونایە. ئەو کات وولاتمان چەند ئـــاوەدان و میللەتمان چەند خۆشگوزەران دەبوو...

بەڵێ ئیمانداران: هەرکەسێ تەنها خۆی ببینێ و ئەنانی بێ و وابزانـــێ تەنها ئەو شـــتەو خەڵکی تـــر هیچ نین و بەچاوی ســـوك سەیریان بکات، ســـەرەنجام توشـــی نەهامەتی و ڕۆژی ڕەشی تەریق بونەوەو شەرمەزاربون دەبێت. وەك نمونەی ئەم ڕوداوە:

یەکێك لەزانایانی زمانەوانی پێویســـتی بە کڕینی کەلوپەل بوو، بۆ ئەم مەبەســـتە دەبوایە بچێتە بەشـــێکی تری شارەکە، بەمەش پێویســـتی دەکرد بە ڕوبارێکدا تێپەڕێت کە شارەکەی کردبوو بە دوو بەشـــەوە. لەو کاتەشـــدا تەنها بەلەمێکی سادە ئامادەبـــوو، ئـــەو بەناچـــاری ڕازیبوو کە بە بەلەمە ســـادەکە بپەڕێتـــەوە، لەبەر ئەوەی زاناکە خۆی بە خاوەنی زانســـت و

زانیاری دەزانی، ڕوخساری بێزاری و بێتاقەتی پێوە دیار بوو، لەبەر خۆیەوە دەیگوت کە چۆن بەو هەموو زانست و زانیاریەوە چۆتە ناو بەلەمێکی سادەو بچوکەوە، لەگەڵ بەلەمەوانێکی سادەو هەژاردا، بێزاری زاناکە زیاتر بوو بەتایبەت کە هەستی کرد کە خاوەن بەلەمەکە نایناسێت و مامەڵەیەکی وای لەگەڵدا ناکات کە شایانی پلەو پایەی ئەو بێت.

زاناکە بە بەلەمەوانەکەی ووت: نامناسیت؟! ئەویش بەدیقەتەوە سەیری کرد تا بزانێ لە کوێ بینیویەتی، بەڵام نەیتوانی بیناسێتەوە، بۆیە بەئەدەبێکەوە ووتی: بمبورە، ڕۆژانە زۆر کەس دێنە بەلەمەکەمەوە، ناتناسمەوە.

زاناکە ووتی: تا ئێستا نەهاتومەتە بەلەمەکەتەوە بە هۆی سەرقاڵیم بەوانە وتنەوەوە لە زانکۆ، بەکەمی لەشار دەچمە دەرەوە، وادیارە تۆش زۆر لەبارەی زانکۆوە نازانیت، لەوانەیە تا ئێستا سەردانیشت نەکردبێت، ئەگینا ئەتزانی کە من فلانی کوڕی فلانم.. زانایەکی بەناوبانگی زمانەوانیم!!.

ڕوخساری بەلەمەوانەکە لە شەرمدا سور هەڵگەڕاو بەڕوخۆشیەکەوە ووتی: جارێکی تر داوای لێبوردن دەکەم کە نەمناسیتەوە. شانازیە بۆ من و بۆ بەلەمەکەم لەم گەشتەدا کەسێکی وەکو تۆ هاوڕێمانە.

زاناکە بە فیزێکەوە ووتی: گوێ مەدەرێ!!..

خاوەنــی بەلەمەکــە چەند پارچە شــیرینیەکی پێشــکەش بە میوانەکــەی کردو لەلایەکی بەلەمەکەیدا دانیشــت، کە زۆر بەهێواشــی بە ئاوەکەدا تێدەپەڕی، لەگەڵ ئەوەشــدا زاناکە وای هەست کرد کە بەلەمەوانەکە نرخی میوانەکەی نازانێت، ویستی بەهــاو پلەو پایەی خــۆی بۆ دەربخات، بانگی کــرد ووتی: ئایا تا ئێســتا هۆنــراوەی فۆلکلــۆرت خوێندۆتەوە؟ یــان هۆنراوەی شاعیرە کۆنەکانت لەبەرکردوە؟!.بەلەمەوانەکە سەیرێکی کردو بەسادەییەکەوە ووتی: نەخێر هیچ کام لەوانەم نەخوێندۆتەوە.

زاناکە ووتی: خەفەتت بۆ دەخۆم، نیوەی تەمەنت بە فیرۆ چووە!!

دوای کەمێکــی تــر زاناکــە گەڕایەوە بۆ ئــەوەی گرنگی و گەورەیی خۆی لەســەر بەلەمەوانە هەژارەکــە تاقی بکاتەوە، پێــی وتەوە: ئایــا وتووێژی بەناوبانگی نێــوان هەردوو زانای بەناوبانگ (ســێبەوەیهی و کەســائی)ت ســەبارەت بە بابەتی (زەنبوری) بیستووە؟.

پیاوەکــە زۆر ســەری ســوڕما لــەوەی کــە دەیبیســتێ، بەزمانێکــی تێکەڵ و پێکەڵ وەڵامی دایەوە: بەداخەوە نەخێر نەمبیستووە.

زاناکە دووبارە بە سەرسوڕمانەوە ووتی: خەفەتت بۆ دەخۆم نیوەی تەمەنت بە فیڕۆ چووە!.

دوای کەمێکی تر دووبارە گەڕایەوە بۆ پرسیار کردن و ووتی: لەوانەیە دەســتت دانا بێت لەسەر بەمەبەستەکانی زمانەوانی لای (جەریرو فرەزدەق)، ئایا چی لەیەکتریان جیادەکاتەوە؟!.

بەلەمەوانەکــە بێزار بــوول لە پرســیارکردنەکانی ووتی: نەخێر تا ئێستا ئەو شتانەم نەبیستووە.

زاناکــە هەســتی کــرد کە خەریکــە مەبەســتەکەی خۆی دەگەیەنێت. دووبارە پێی ووت: خەفەتت بۆ دەخۆم بەڕاســتی نیوەی تەمەنت بەفیڕۆ چووە!!.

خاوەنــی بەلەمەکە بێزاری خۆی شــاردەوەو خۆی خەریك کرد بەکارەکەیەوە.

پێــش ئەوەی بەلەمەکە بگاتــە کەنارەکە بایەك هەڵیکردو بەلەمەکەی لەراندەوە، زاناکە بەمە بێزاربوو، بە دوودڵیەکەوە ووتی: ئەوە چیە؟! بەلەمەوانەکە چارۆکەی بەلەمەکەی گرت و ویســتی وانەیــەك فێری زاناکە بکات، کــە هەرگیز لەبیری نەچێتەوە..

وتــی: ئەمــە بایەکــی هێواشــە، زاناکە لە جێگــەی خۆی دانیشــتەوە، پێش ئەوەی شێوەی ڕوخســاری ئاسایی ببێتەوە،

بەلەمەوانەکە لەناکاو پێـــی ووت: هەڵکردنی ئەم بایە مایەی ئەوەیـــە کە بایەکی بەهێز بەڕێوەیە، لەوانەشـــە گەردەلولێك بێت، کە هەرچی بەلەم و کەشتی گەورە هەیە هەڵی بگێڕێتەوە، زاناکە بە بیستنی ئەو قسانە زۆر ترسا ووتی: ئەو کاتە چیمان بەسەردێت؟!

پیاوەکـــە وەڵامـــی دایەوە: خـــەم مەخۆ، زۆرمـــان نەماوە، دەتوانین هەتا کەنارەکە مەلە بکەین، زاناکە بەسەرســـامیەوە ووتی: مەلە بکەین؟!

بەلەمەوانەکەش بەوپەڕی متمانە بەخۆبونەوەو هاوشێوەی پرسیارە گاڵتەئامێزەکانی زاناکە پرسی: بۆچی مەلە نازانیت؟!!

زاناکە ووتی: نەخێر. بەلەمەوانەکە پێی ووت: زۆر بەداخەوەم بۆت، هەموو تەمەنت بەفیرۆ چووە!!

تەمەنی زاناکە بەفیرۆ نەڕۆیشت، ڕوبارەکە بچوکەو هەرگیز تۆفان و گەردەلول تیا هەڵنـــاکات. زاناکە وایدەزانی دەتوانێت هەرچـــی پێی خۆش بێت بیڵێت و زۆر بەشـــان و باڵی خۆیدا هەڵبـــدات. بـــەڵام بۆی دەرکـــەوت کە زۆر شـــت هەیە کە ئەو نایزانێت و بەو کردارەی ڕێزی کەســـانی تر لەدەســـت دەدات، لەوانەشە ببێتە هۆی ڕق لێبونەوەی کەسانی تر..

بەڵـــێ هەرکەســـێ ئاوا ئەنانـــی بێت و وابزانـــێ تەنها هەر

ئــەو هەیەو گاڵتەی بە پیشــەو عەقڵی خەڵکــی بێت، ئاوا بە دڵنیاییەوە لە نزیکترین کاتدا، خۆی تێدەکەوێ، ئەمجا دەزانێ کە ئەمیش هێشتا لە زۆر شتی کەمەو ئەو بەهرانەی کەسانی تــر کــە ئەم بە بچوکیان دەزانێت هەیانــە، ئەم نیەتی و زۆر لەخوار ئەوانەوەیە.

بەهیــوای دوربــون لــە ئەنانیــەت و خودپەســەندی و بەخۆداچونەوەو خۆناسین.

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي ٱلْأَخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾

اللهمَّ آمين

## سەرچاوەکان:

١. قورئانی پیرۆز.

٢. نامیلکەی (لاشەی ئادەمیزاد) جلال الدین نجم الدین. ل ٨.

٣. گۆڤاری بڕیار، ژ ٤٧، ل ٢١. وە ژمارە: ٥٣، ل٤٤.

٤. گۆڤاری (دوانگە) ژمارە: ٣٢-٣٣، ل٥٣.

٥. ڕۆژنامەی (باسك) ژمارە: ٥٠٥، ل١٢.

﴿ هَٰذَا مِن فَضۡلِ رَبِّي
لِيَبۡلُوَنِيٓ ءَأَشۡكُرُ أَمۡ أَكۡفُرُۖ
وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشۡكُرُ
لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ
رَبِّي غَنِيّٞ كَرِيمٞ ﴾

النمل: ٤٠

